٣

ئینگلیزی - کوردی

# مافەکانی ئافرەت لەئیسلامدا

ئایا مافەکانی ئافرەت
مافی کۆنەپەرستن یاخود هاوچەرخن؟



پەیجی هاوڕێیانی پەرتووک pdf

◀ د.زاکیر نایک

◀ وەرگێڕانی: ابوبکر احمد

◀ بەسەرپەرشتی: تروسکە محمد

**Women Rights In Islam**

# مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا

**Modernising or Outdated?**

## ئایا مافەکانی ئافرەت مافی کۆنەپەرستن یاخود هاوچەرخن؟

*Written by: Dr. Zakir Naik*

نوسینی : د. زاکیر نایک

***Translated by: Abubakir Ahmed Khidir (Third year_ Salahaddin University)***

وەرگێرانی: ابوبکر احمد خدر(قۆناغی سێهەم، زانکۆی سەلاحەدین)

**Supervised: Truska Muhamad Alaadin**

بە pdf کردنی: سامان عبدالرحمن

ناوی کتێب: مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا......

نوسینی : د. زاکیرعبدالکریم نایك

وەرگێڕانی/ ابوبکر احمد خدر

تایپ : وەرگێڕ

بەرگ/ ئیبراهیم ساڵح

سەرپەرشتی ئینگلیزی : تروسکە محمد علاءالدین

چنی کوردی/ موسامحمدڵەدیزاین و هە

نرخ (3000) دینار

تیراژ ١٠٠٠ دانە

**لەبەرەێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی (١٧٨٢) ی ساڵی 2016ی پێدراوە.**

**بەرهەمی هاوبەشی ( خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا )و کتێبخانەی جودی لە قەڵادزێ .**





دیاری بێت بۆ بەڕێز.........................................................

لەلایەن برات................................................

بەرواری/.............................................................

بەئومێدی دوعای خێری جەنابت و سودو قازانجی دنیایی و قیامەتی .

# پێشکەشە:-

- ✓ بە دایک و باوکی ئەزیزم.
- ✓ مامۆستای خۆشەویستم"تروسکە محمد علاءالدین"
- ✓ تۆی خوێنەری ئازیز.

لەگەڵ بەدیکردنی هەرهەڵەیەک یان هەبوونی هەرپێشنیارێک تکایە ئاگادارم بکەنەوە لە ڕێگەی


- ➢ Mail. Abubakrghazali93@gmail.com
- ➢ Mo. 0750 194 19 95

# پێشەکی "وەرگێڕ"

ئیسلام ئاینێکەکۆمەڵێ یاسای بنەڕەتی و ماف و ئەرکی لەسەر مرۆڤ داناوەو مافی هەموشتێکی دیاری کردوەچ جای مافەکانی ئافرەت. چۆن ماف و ئیمتیازی بۆپیاو داناوەهەرواش مافی ئافرەت لە باوەش دەکات و پارێزگاری لێدەکات،

ئەوەتا هەر ئیسلام بوو کە ئافرەتانی لە زیندە بەچاڵی ڕزگارکرد لەسەر دەمی نەفامیدا، ئەگەر تەماشی ئیسلام بکەیت و بەوردی لە کرۆک و ناوەڕۆکی تێبگەی دەبینی کە ئیسلام بە چەندان سەدە لەمەوبەر مافی بە ئافرەت نەک هەر ڕەوا بینیوەبگرەدەیان پلەی بەرزی پێ بەخشیوە.وەک بەهەشت لەژێر پێدابوون و مامۆستای پەروەردەی کۆمەڵگا.کەمرۆڤایەتی پێشتر و ئێستاش لەگەڵ دابێت ، وەک ئیسلام نەیان توانیوەئەوڕێزەلەئافرەت بنێن ..

ئەمڕۆش لە کۆڕو کۆبونەوە و بەرنامە تەلە فیزیۆنیەکاندا باس لەوە دەکرێت و دەش بیسترێت کە ئیسلام ماف بە ئافرەت نادات و یاخود

ئەگەر مافی پێشدابێت ئەوا ئەوانە مافانێکی کۆنەپەرستن و ئەمرۆ باویان نەماوە یان بەشێوەیەکی دیکە لەگەڵ سەردەم و تەکنەلۆژیا ناگونجێن.

بەڵام ئەمانە هەر قسەن و هیچی دیکە، لەسەرجەم بوارە جیاوازەکاندا پێشکەوتنی زانست و زانیاری هێماو موعجیزەی ئیسلامی سەلماندوە، دەبێت لە ئیسلامدا تێبنیەکی گرنگ ڕەچاو بکەین ،

کە دەبێ ئێمە ئیسلام لە تاکی موسوڵمان یاخود لە گۆمەڵگەی ئیسلامەوە نەناسین، چونکە ئەوان ئاوێنەی ئیسلام نین، ئەگەر بمانەوێت لە کرۆکی ئیسلام تێبگەین دەبێت لە خودی قورئانەوە یان فەرمودەکانەوە ئیسلام بناسین و فێربین.

واتە، دەبێت لە قورئاندا بەدوای نرخ و بەهای ئافرەتاندا بگەڕێین نەک لەئەملاو ئەولای دیکە، بۆیە لێرەدا نایک بەوردی باس لە نرخ و بەهای ئافرەت دەکات لە ئیسلامدا کە هەردوو ڕەگەز تەواوکەرو یەکسانن لە ئیسلامدا و هیچ جیاوازیەکیان لە نێواندا نیە.

و_ ابوبکر احمد

قۆناغی سێهەم، زانکۆی سەلاحەدین



# نایک لەچەند دێڕێکدا

**هەرچەندە ژیان نامەو ناساندنی دکتۆرزاکیرنایک لە چەندکتێباندا و لە ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت، ناسێندراوە.بەلای خوێندەوارو ڕۆشنبیرانی کورد نامۆوو غەریب نیە. کەبەسەدان ووتارو دیبەیت ومونەاقەشەی تۆمارکراوی هەیە. وەڵامی زۆر بەپێزو بەتێز، دەداتەوە کەتینویەتی گومانکاران لەبیابانی ووشک هەلاتوی جەهل و نەزانین تێرئاودەکات بۆیەلێرەش بەپێویستمان زانی کورتەیەک لەژیانی ئەو دەریا زانیاریەی کەبەکۆمپیوتەری ئیسلامیش ناسروە،بەتۆی خوێنەر ئاشناترکەین...**

دکتۆر زاکیر عبدولکریم نایک لە ١٨ئۆکتۆبەری ١٩٦٥ لە مۆمبای هیندستان لە دایک بووە. خێزانەکەی ناوی "فەرهات"ە و خاوەنی دوو منداڵە بە ناوی "فارق و ڕوشدە "هەر لەشاری مۆمبای خوێندنی تەواوکردوە و بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە. لەساڵی ١٩٩١ دەستی بە بانگخوازی"دعوە" کردووە. هەریەک لە پەرتوکە پیرۆزەکانی ئاینە جیاوازەکانی وەک ئاینی (ئیسلام- مەسیحی- یەهودی-هیندۆسی-بوزی)یەکانی لەبەرە ،بۆئەم مەبەستەش سەردانی چەندان وڵاتی کردوو "ئەمریکا، سعودیە، هۆنگکۆنک، کوێت، سەنگافورە، ئوستوڕالیا، باشوری ئەفریقا، بەحرەین، قەتەر، ئەمەریکای باشور، تایلاند، کەنەدا...هتد،

بەسەر كەوتویی بەشداری لەچەندان كۆڕو دیالۆگ كردووە، باوتریشیان بریتی بوو لەودیالۆگەی كە لەگەڵ دكتۆر ولیەم كامبێڵ كردی لە شیكاگۆی ئەمریكا لە ١ نیسانی ٢٠٠٠.

بەڕێوبەری كەناڵی "ئاشتی"یە كەكەناڵێكی جیهانی ئیسلامیەو زۆربەی كۆڕ و دیبەیتەكانی لەم كەناڵەوەپەخش دەكرێت، ئەمەبێجگەلەوەی كەلەڕێگای (گۆڤار-كاسێت)ەوەچالاكیەكانی بڵاو دەكرێتەوە. نایك لە چەندان تەلەفزیۆن و كاناڵی نێودەوڵەتیشدا دەردەكەوێت و بانگهێشت دەكرێت بۆ چاوپێكەوتن، چەندان كتێبی داناوە بەناوی " ئایە قورئان وتەی خوایە. قورئان و زانستی هاو چەرخ ...."

# Definition

## پێناسەی "ماف"

According to the Oxford dictionary, 'Women's Rights are the rights that promote a position of social and legal equality, of women to men'

بەپێی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد، مافەکانی ئافرەت ئەو مافانەن کە پێگەی کۆمەڵایەتی و یەکسانی یاسایی بەرزدەکەنەوە بۆڕاستی پیاو.

According to the Oxford dictionary, 'they are the rights, claimed for the women, equal to those of men, as regards to suffrage that right to vote, as regards to property, etc'.

هەر بەپێی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد، ئەو مافانەن  کە بۆ ئافرەت داواکراون یەکسان بن بەمافەکانی پیاو، وەکو مافی دەنگدا و مافی سامان هیتد.

'Modernising', according to the Oxford dictionary means, 'to make modern, to adapt to modern needs or habits'.

'نوێکردنەوە'. بەپێی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد واتە تازەکردنەوە"هاوچەرخ"، بۆ گونجاندنی نەریت و پێداویستیەکان،

And according to the Webster's dictionary it means... 'To make modern, or to give a new character or appearance - e.g., to modernise ones ideas'.

بە پێی فەرهەنگی وێبستەر واتە... تازە كردنەوە یاخود پێدانی سیفەتێكی نوێ یان ڕووالەتێكی نوێ– بۆنمونە نوێكردنەوەی بیرۆكەكانی كەسێك.

In short, modernising is a process of updating or opting for the betterment of the present status itself - It is not the present modern status itself.

بەكورتی، تازەكردنەوە قۆناغێكە لە نوێكردنەوە یان باشتركردنی بارو دۆخەكە خۆی– ئەوە تەنیا دۆخێكی نوێی هەنوكەیی نیە

Can we modernise ourselves, to master our problems, and to realize a new way of life, for the whole human race?_and inexperienced armchair experts, as how a life should be lived by a woman.

ئایە دەتوانین خۆمان نوێ بكەییەنەوە ببین بە گەورەی كێشەكانمان دەرك بە ڕێگایەكی نوێی ژیان بكەین، بۆ نەژادی مرۆڤ؟

I am not concerned about the modern ideas, the conclusions and the categorical statements made by scientists

من تەداخولی بیرۆکەکانی هاوچەرخ ناکەم کەلەلایەن زاناو پرۆفیسۆرە ناشارەزاکانەوە گوتراون، کە چۆن ژیان لای ئافرەت گوزەردەکات.

I am going to base my conclusions and considerations on truth, which can be proved by experience.Experience and unbiased factual holistic analysis, are the sure test, between the gold of truth, and the glitter of theory.

من تیشک دەخەمە سەر ئەنجام و بیروڕاکان لەسەر بنەمای ڕاستی، کە ئەزمون و تاقیکردنەوە دەیانسەلمێنێت. شیکردنەوەی ئەزموون و ڕاستی بێلایەن تاقی کردنەوەی ڕاستەقینەن لەنێوان ڕاستی زێڕین و تیۆری بریقەدار دا...!!!

We have to check our thinking against reality, otherwise many a times, our mental process will go astray - Indeed the great brains of one time, believed that the world was flat.

پێویستە بیرکردنەوەمان بپشکنین لەئاستی واقیعدا، ئەگەرنا زۆر کات پرۆسەی بیرمان بەرەو گومڕایی دەچێت. لەڕاستیدا سەردەمانێک زاناکان پێیان وابووە کە زەوی تەخت بووە.

❊❊❊

# *Women Rights in the West*

# مافەکانی ئافرەت لە رۆژئاوا

If we agree with the 'Women's rights in Islam', as portrayed by the Western media, you have no option, but to agree that the 'Women's rights in Islam' are outdated.

ئەگەر ئێمە مافەکانی ئافرەتمان قبوڵبێت لە ئیسلامدا، هەروەک لە میدیا رۆژئاواییەکان وێنەیان کێشراوە، هیچ بژاردەیەکت نیە بەڵکو هاورا دەبیت کە مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا کۆنەپەرستن.

The Western talk of women's liberation is actually a disguised form of exploitation of her body, deprivation of her honor and degradation of her soul.

قسەی رۆژئاواییەکان لەسەر ئازادی ئافرەت، لەراستیدا بریتیە لە شێوەیەکی پەردەپۆشکراو لە چەوساندنەوەی جەستەی، نەهێشتنی رێزی، نزمکردنەوەی گیانی......

The Western society which speaks of upgrading the status of women in Islam, have actually reduced her status to concubines, to mistresses, to society butterflies, which are mere tools in the hands of sex marketers and pleasure seekers, which are disguised behind the colorful screen of art and culture.

کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا کە قسە لە بارەی بەرزکرنەوەی دۆخ وبەهای ئافرەت دەکات لە ئیسلامدا، لەڕاستیدا دۆخی ئافرەتیان نزمکردۆتەوە بۆناستی جاریە، خانم، پەروانەی کۆمەڵگا، کە ئامێرێکن لە ژێر دەستی بەقاڵە سێکسیەکاندا و لەژێر دەستی ئەوانەی بەدوای خۆشیدا دەگەڕێن. کە لە پشتی شاشەیەکی ملەوەنی کالتور و هونەردا پەردەپۆش کراون.

# *Women Rights in Islam*

# مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا

Islam's radical revolutionary support, gave women their due right and stated in the days of ignorance... 1,400 years ago.

شۆڕشی ڕادیکاڵی ئیسلامی، مافی ئافرەتی داوە و دەربخستوە لە ڕۆژانی نەزانی...١٤٠٠ساڵ لەمەو بەر.

Islam's objective was and continues to be, to modernise our thinking, our living, our seeing, our hearing, our feeling and striving for the women's upliftment and emancipation in the society.

ئامانجی ئیسلام بریتی بووە لە نوێکردنەوەی بیرکردنەوەمان، ژیانمان، بینینمان، بیستنمان، هەستمان هەروەها خەبات کردن بۆ بەرزکرنەوە و ئازادکردنی ئافرەت لە کۆمەڵگادا و بەردەوامیش دەبێت.

*Before I dwell further with the topic, I would like you to make note of a few points.*

پێش ئەوەی زیاتر لە بابەتەکە بدوێم، حەزدەکەم سەرنجی هەندێک تێبینی بدەیت.

* Approximately one fifth of the world's population consists of Muslims. There are different Muslim societies - Some may be close to Islam, some may be far away from Islam.

نزیکەی ١ لەسەر ٥ ی دانیشتوانی جیهان پێک هاتوە لە موسوڵمان.

کۆمەڵگەی موسوڵمانی جیاواز هەن- لەوانەیە هەندێکیان لە ئیسلام

نزیک بن، لەوانەشە هەندێکیان دوربن لە ئیسلام.

* The 'Women's rights in Islam' should judge according to the authentic sources, and not what individual Muslims do, or what the Muslim society does.

دەبێت مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا بەپێی سەرچاوە ڕاستەکان

بڕیاریان لەسەر بدرێت، نەک ئەوەی کە تاکی موسوڵمان دەیکات، یان

کۆمەڵگەی موسوڵمان دەیکات.

* The authentic sources of Islam are the Qur'an, which is the word of God, and the authentic Sunnah, and the traditions of our beloved Prophet (peace be upon him).

سەرچاوە ڕاستەقینەکانی ئیسلام بریتین لە قورئان کە وتەی خوایە

هەروەها سوننەت و خورەوشتی پێغەمبەری خۆشەویستمان "سەلامی

خوای لەسەربێت"

* Qur'an will never contradict itself, nor will the authentic Hadith contradict itself… neither will these two authentic sources, contradict each other.

هەرگیز قورئان ناکۆکی تێدانیە، نە فەرمودەی صحیحیش…

ئەو دوو سەرچاوانە هیچ دژایەتیەکیان تێدانیە.

* Sometimes the scholars differ, and many a times, these differences can be removed by analyzing the Qur'an as a whole, and not just by quoting one particular Verse. Because if one particular verse of the Qur'an is ambiguous many a times the answer is given somewhere else in the Qur'an - Some people quote one source and neglect all the other sources.

هەندێ جار زاناکان جیاوازن، زۆرجار ئەم جیاوازیانە نامێنن بە لێکدانەوەی قورئان وەک هەمووی "قورئان" نەک تەنیا بە وتەیەک لە ئایەتێکی تایبەتدا، چونکە ئەگەر ئایەتێکی تایبەت لە قورئاندا ناڕون بوو زۆر جار وەڵامەکە لە شوێنێکی تر دوارە لە قورئاندا- هەندێك خەڵک یەک سەرچاوە وەردەگرن و سەرجەم سەرچاوەکانی تر فەرامۆش دەکەن.

* It is the duty of every Muslim, male or female, to seek the pleasure of God, and to act as His trustee on this world, and not to try and gain fame or satisfy one's own ego.

ئەركی هەموو موسوڵمانێكە ( نێر و مێ ) بۆئەوەی ڕەزامەندی خوا بەدەست بهێنێت و كاربكات وەك ڕاسپاردەی ئەو لەم جیهانەدا، نەوەكو هەوڵی ناوبانگی و خۆپەسندی خۆی بدات.

Islam believes in equality of men and women – 'Equality' does not mean 'identicality'.

ئیسلام باوەڕی بە یەكسانی پیاوان و ژنان هەیە– یەكسانیش بەواتای "وەك یەكی نایەت"

In Islam, the role of a man and woman is complimentary, it is not conflicting. It is that of a partnership, it is not contradictory, so as to strive for supremacy .Where 'Women's rights in Islam' is concerned, I have divided it into 6 broad categories.

لە ئیسلامدا، ڕۆڵی پیاو و ئافرەت تەواوكەریە نەوەكو ململانێ. ئەوە هاوڕێیەتیە، ناكۆكی نیە، خەباتكردنە لە پێناو بەرزی و بڵندیدا، لە ئیسلامدا مافەكانی ئافرەت بایەخیان پێدراوە، منیش دابەشم كردوون بە سەر شەش جۆری فراواندا.

# *Six Categories of Women Rights in Islam*

## شەش جۆر لەمافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا

The first are 'the Spiritual rights', second are 'the Economical rights', third are 'the Social rights', fourth are 'the Educational rights', fifth are 'the Legal rights', and last are 'the Political rights'.

یەکەمیان "مافە گیانیەکان" دووەمیان "مافە ئابوریەکان" سێهەمیان "مافە کۆمەڵایەتیەکان" چوارەمیان "مافە پەروەردەییەکان" پێنجەمیان"مافە یاساییەکان" شەشەمیان"مافە سیاسیەکان".

Sex is Not the Criteria to Enter Paradise: The greatest misconception that the West has about Islam, is that they think... 'Paradise in Islam is only meant for the male - it is not meant for the female'.

ڕەگەز بنەمای چوونە بەهەشت نیە: گەورەترین هەڵەتێگەیشتن کە ڕۆژئاوا هەیەتی بەرامبەر بە ئیسلام، ئەوەیە کە پێیان وایە... بەهەشت لە ئیسلامدا تەنیا بۆ ڕەگەزی نێرینەیە- بۆ ڕەگەزی مێینە نیە.

This misconception can be removed by quoting from Surah Nisa, Chapter. No. 4, Verse No 124, which says, 'If any of you do deeds of righteousness, whether it be male or a female and has faith, they shall surely enter Paradise and not the least injustice shall be done to them'

ئەو هەڵەتێگەیشتنەش دەتوانرێت ڕەتبکرێتەوە بە وتەیەک لە سورەتی النساء بەشی ٤، ئایەتی ژمارە ١٢٤ کەدەفەرموێت: ئەگەر هەرکامێک لەنێوە کاری باش ئەنجام بدات نێر بێت یان مێ لەکاتێکدا ئیماندار بێت، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە و بەهیچ شێوەیەک ستەمی لێناکرێت.

A similar thing is repeated in Surah Nahl, Ch.16, Verse No.97 which says... 'If any of you perform good deeds, be it a man or a woman and is a believer, We shall give you good life and We should reward you for all your good works'.

هەمان شت دوبارە بۆتەوە لە سورەتی النحل بەشی ١٦، ئایەتی ژمارە٩٧، کەدەفەرموێت... ئەوەی لە نێوە کارو کردەوەی چاک بکات، پیاو بێت یان ئافرەت لەکاتێکدا بڕوادار بێت، ئێمە ژیانێکی کامەران و ئاسوودەتان لە دنیادا پێدەبەخشین، لەقیامەتیشدا پاداشتان دەدەینەوەلەو کارە باشانەی کەکردوتانە.

Just because in Islam, sex is not the criteria to enter Paradise, will you call such rights in Islam as modernising or outdated?

تەنیا لەبەرئەوەی لە ئیسلامدا، ڕەگەز بنەمای چونە بەهەشت نیە بەئەو مافانە لە ئیسلامدا دەڵێیت مافی هاوچەرخ یان کۆنەپەرست؟

## 1- *Spiritual Rights of Women in Islam*

## مافە گیانیەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا

Another misconception is that, which the Western media has, that, 'The woman has no soul'. In fact, it was in the seventeenth century, when the Council of wise men, gathered at Rome, and they unanimously agreed that the woman had no soul.

هەڵە تێگەیشتنێکی دیکە کە میدیا ڕۆژئاواییەکان هەیانە ئەوەیە ئافرەت هیچ گیانێکی نیە. لەڕاستیدا ئەوە لە سەدەی حەڤدەهەم وابوو، کاتێک ئەنجومەنی پیران لە (ڕۆما) کۆبۆیەوە، بەتێکڕایی دەنگ هاوڕابوون کە ئافرەت هیچ گیانێکی نیە.

In Islam, man and woman have the same spiritual nature. It is mentioned in Quran, Ch.4, Verse No.1, which says that, 'O humankind reverence you're Guardian Lord, who has created you from a single person and created like nature his mate'.

لە ئیسلامدا پیاو ئافرەت هەمان گیانی سروشتیان هەیە. ئەوەش لە قورئاندا باسکراوە، بەشی ٤، ئایەتی ژمارە١، کەدەڵێت: ئەی خەڵکینەلەخەشم و نارەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کەئێوەی لەتاکەنەفسێک دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناوە.

A similar thing is mentioned in Surah Nahl, Ch.16, Verse No.72, which says that, 'We have made for you companions and mates of your own nature'.

هەمان شت لە سورەتی النحل بەشی ١٦، ئایەتی ژمارە٧٢: كە دەفەرموێت، ئێمە هەر لە خۆتان هاوسەرانمان بۆ بەدی هێناون.

In Surah Al-Shura, Ch.42, Verse No.11, it says, 'He is the one who has created the heavens and the earth and has made for you pairs from among yourselves'.

لە سورەتی الشورا بەشی ٤٢ ئایەتی ژمارە ١١ دەفەرموێت: خوا ئەوزاتەیە كە ئاسمان و زەوی دروست كردووە و لە نێوان خۆتاندا نێرو مێی بەدی هێناوە.

Just because the spiritual nature of a man and woman is the same in Islam, will you call such rights in Islam, as modernizing or outdated?

تەنیا لەبەر ئەوەی ماف گیانی پیاو ئافرەت لە ئیسلامدا وە كویەكە، ئایە تۆ بەو جۆرە مافانە دەڵێیت مافی هاوچەرخ یان كۆنەباو؟

The Qur'an clearly mentions that, 'God has breathed somewhat of His spirit into the human beings'.

قورئان بەڕوونی ئاماژە بەوەدەکات، خوا بەشێک لەگیانی خۆی خستۆتە مرۆڤەکانەوە.

If you read Surah Hijr, Ch.15, Verse No.29, it says, 'When I have fashioned you in due proportion and have breathed into you something of my spirit, fall you down in obeisance'.

ئەگەر سورەتی الحیجر بەشی ١٥، ئایەتی ژمارە ٢٩ بخوێنیتەوە، دەفەرموێت جا کاتێك ڕێك و پێك و تەواوم کرد، لەو ڕۆحەتایبەتیەی کەمن (بەدیهێنەری ئەوم)، پێمبەخشی، ئەوەهەمووتان کڕنووشی بۆ بەرن (کڕنووشی ڕێز بەفەرمانی خوا).

A similar thing is repeated in the Qur'an, in Surah Sajdah, Ch. 32, Verse No.9, which says, 'Then He fashioned him and breathed into him of His Spirit...'

شتێکی هەمان شێوە لە قورئاندا دوبارە بۆتەوە، لە سورەتی السجدە بەشی ٣٢ ئایەتی ژمارە ٩، کە دەفەرموێت، ئادەمیزادی دروست کرد پاشان لە گیانی خۆی فوی پیاکرد...،

Here, when God refers to as 'Something of My Spirit, is breathed into the human beings' - it does not mean, a sort of incarnation or a pantheistic form. It means that Allah has given to every human being something of His spiritual Nature, and the Knowledge of God Almighty, and coming closer towards Him.

لێرەدا، کاتێک خوا ئاماژە بەشتێک دەکات"بەشێک لەگیانم بەمرۆڤدا کردوە "- واتای ئەوە نیە، جۆرێک لە گیان بەبەرداکردن یان شێوەی بونی خوا، واتای ئەوەیە کە خوا بە سەرجەم مرۆڤەکانی بەخشیوە بەشێک لە سروشتی گیانی خۆی و زانست و زانیاری و نزیک بونەوە لە خۆی.

Here it refers to both Adam and Eve (may peace be upon them) - Both were breathed something of God's Spirit.Again we read in the Qur'an, that Allah has appointed the human being as His vicegerent, as His trustee,

لێرەدا ئەوەش ئاماژەیە بۆ هەردووک "ئادەم و حەوا" ڕەزای خوایان لەسەربێت" هەردوکیان شتێکیان لە گیانی خوا پیاکراوە. دوبارە قورئان دەخوێنینەوە خوا مرۆڤ وەک جێنیشین وەک ڕاسپاردەی خۆی داناوە

as is mentioned in Surah Isra, Ch.17, Verse No.70, which says, 'We have honoured the children of Adam and bestowed on them special favours'.

هەوەک لە سورەتی الاسراء بەشی ١٧ ئایەت ژمارە ٧٠ دەفەرموێت، ئێمە ڕێزمان لەنەوەکانی ئادەم گرتوە و پێمان بەخشیون هاوکاری تایبەت.

Note, here all the children of Adam have been honoured, male as well as female. There are some Religious scriptures, for example the Bible, which puts the blame on Eve for the downfall of humanity.

تێبینی، لێرەدا سەرجەم نەوەکانی ئادەم ڕێزیان لێگیراوە ، ڕەگەزی نێر هەروەها ڕەگەزی مێ. هەندێک پەڕاوی ئاینی هەن ، بۆ نمونە ئینجیل ، کە لۆمەی حەوا دەکات بۆ نە هامەتیەکانی مرۆڤایەتی.

In fact if you read the Qur'an in Surah Araf, Ch.7, Verse No.19 to 27, Adam and Eve (may peace be upon them both) are addressed, more than a dozen of times. Both disobeyed God, both asked for forgiveness, both repented, and both were forgiven.

له ڕاستیدا ئەگەر له قورئاندا سورەتی الاعراف بخوێنیتەوە بەشی ۷ ئایەت ۱۹تا ۲۷ ئادەم و حەوا" سەلامی خوایان لەسەر بێت" زیاتر له دوازده جار ئاماژەیان پێکراوە، هەردووکیان بۆ ئەمری خوایان کرد. هەردووکیان داوای بەخشنیان کرد، هەردووکیان گەڕانەوە، هەروەها هەردووکیان بەخشران.

The Qur'an does not blame Eve for tempting Adam to eat the forbidden fruit or for the downfall of man, as has been done by the Bible and other scriptures. In Surah Al-Aaraf, Chapter, verse 19-27

قورئان سەرزەنشتی حەوا ناکات بۆ هاندانی ئادەم بۆ خواردنی میوه قەدەغەکراوەکه یان نەهامەتیەکانی مرۆڤ، هەروەک له ئنجیل و پەڕاوەکانی تردا گوتراوە، سورەتی الاعراف له ئایەتی ۱۹ تاوەکو ۲۷ لەسەر ئەوە دەدوێت.

There is not a single passage in the Qur'an that only points to Eve. However there is one verse in the Qur'an from Surah Taha chapter 20, verse 121 which specifically puts the blame on Adam (Pbuh).

هیچ دەقێک لە قورئاندا نیە کە تەنها ئامازەبێت بۆ حەوا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئایەتێک لەقورئاندا هەیە لە سورەتی طه بەشی ٢٠ ئایەتی ژمارە ١٢١ کە بە تایبەتی لۆمەی ئادەم دەکات.

In the Bible, if you read Genesis, Ch. 3, only Eve is held responsible (May peace be upon her) for the downfall of humanity. And according to the doctrine of 'Original Sin', because of Eve (May peace be upon her) the whole of humanity is born in sin.

لە ئینجیلدا، ئەگەر کتێبی "دروستبوون" بخوێنیتەوە بەشی ٣، تەنیا حەوا بەرپرسیاریەتی هەڵگرتوە "سەلامی خوای لەسەربێت" بۆ نەهامەتیەکانی مرۆڤایەتی. هەروەها بە پێی بیروباوەری "یەکەمین تاوان" لەبەر حەوا " سەلامی خوای لەسە بێت " هەموو مرۆڤایەتی لە تاواندا لەدایک بووە.

❊❊❊

## *A- Does Pregnancy Uplift the Women or Degrade?*

## ئایە سكپڕبون پلەی ئافرەت بەرزدەكاتەوە یان نزمی دەكاتەوە ؟

If you read the Bible in Genesis, Ch. 3, Verse No.16, it says that, 'To the woman He (God) said, "I will greatly multiply your pain in childbearing; in pain you shall bring forth children, yet your desire shall be for your husband, and he shall rule over you."

ئەگەر لە ئینجیلدا كتێبی "پەیدابوون" بخوێنیتەوە بەشی ٣ خەتی ژمارە ١٦ دەڵێت؛ بەزۆری ئازاری منداڵ بەخشینت چەندجارە دەكەم، لەو ئازارەدا تۆ ژیان بە منداڵ دەبەخشیت، لەكاتێكدا ئەو داخوازیە بەدەست مێردەكەتە، ئەو بڕیار دەدات.

That means, pregnancy and child birth has been said in the Bible to degrade the women and the labour pain is a sort of punishment.In fact if you read the Qur'an, pregnancy and child birth have uplifted the women.

واتە، منداڵ بوون و سکپڕبون لە ئینجیلدا گوتراوە بۆ نزمکردنەوەی پلەی ئافرەت، ئازارەکەشی جۆرێکە لە سزا. لەڕاستیدا ئەگەر قورئان بخوێنیتەوە، منداڵبون و سکپڕبون پلەی ئافرەتانی بەرزکردۆتەوە.

If you read Surah Nisa, Ch.4, Verse No.1, it says, 'Respect the womb that bore you'. It's mentioned in Surah Luqman, Ch.31, Verse No.14, it says, 'We have enjoined on the human being to be kind to the parents, in travail upon travail did their mother bore them and in years twain was their weaning'.

ئەگەر سورەتی النساء بەشی٤، ئایەتی ژمارە ١ بخوێنیتەوە دەفەرموێت: ڕێز لەو منداڵدانە بگرە کەژیانی بەتۆ بەخشیوە. لە سورەتی القمان دا باسکراوە بەشی ٣١ ئایەتی ژمارە١٤، دەفەرموێت: ئێمە فەرمانمان بەمرۆڤەکان کردووە کە لەگەڵ دایک باوکیان میهرەبان بن، ئازار لەدوای ئازار دایکیان ژیانی بەئەوان بەخشیوە و بۆماوەی دووساڵیش شیریان پێدەدرێت.....

A similar thing is mentioned in Surah Ahqaf, Ch.46, Verse No.15, it again repeats, which says, 'We have enjoined on the human beings to be kind to his parents'. To be kind to the parents - in pain did their mother bore them, and in pain did she give them birth - Pregnancy in the Qur'an has uplifted the women not degraded her.

هەمان شت لە سورەتی الاحقاف دا باسكراوە، بەشی ٤٦ ئایەتی ژمارە ١٥ دیسان دوبارە دەبێتەوە، كەدەفەرموێت: ئێمە فەرمانمان بەمرۆڤەكان كردووە كە لەگەڵ دایک باوكیان میهرەبان بن. ئێمەفەرمانمان بەئادەمیزاد داوەكە چاكەكارو چاک ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوكیدا، دایكی بەئازارەوەهەڵی گرتووەو بەدەم ئێش و ئازارەوە بوویەتی. لە قورئاندا سكپڕی ئافرەتانی بەرزكردوەتەوە نەک نزم.

Just because pregnancy has uplifted the women in Islam will you call such rights in Islam as modernizing or outdated?

تەنها لەبەرئەوەی سكپڕبون پلەی ئافرەتانی بەرزكردۆتەوە لە ئیسلامدا تۆ دەڵێیت ئەم جۆرە مافانە لە ئیسلامدا هاوچەرخن یان كۆنەباون...؟ !!!

## B- Criteria in the Sight of God to Judge C- Male and Female

## بنەمای داد پەروەری لە دیدی خوا بۆ ڕەگەزی نێر و مێ

The only criterion for judgment in the sight of Allah is 'Taqwa', 'God consciousness' or 'righteousness'. It is mentioned in Surah Hujurat, Ch.49, Verse No.13 'O humankind, We have created you from a single pair of male and female and have divided you into nations and tribes, so that you shall recognize each other not that you despise each other and the most honored in the sight of God, is the one who is the most righteous'.

تاکە بنەمایەک بۆ دادوەری لەڕووی خوا بریتیە لە "تەقوا" خۆپاراستن" لەسورەتی الحجورات بەشی ٤٩ ئایەتی ١٣ باسکراوە، ئەی خەڵکینەبێگومان ئێمەهەمووتانمان لەنێرو مێیەک دروستکردووە(کەباوکە ئادەم و دایکەحەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرەو هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە... بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانن کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایەبەهەمووان.

Sex, colour, caste, wealth has got no criteria in Islam- The only criteria in the sight of God is 'righteousness', neither is sex the criteria for God to reward or to punish a person.

ڕەگەز، ڕەنگ، هۆز، سامان هیچ بنەمایان نیە لە ئیسلامدا- تاکە بنەما لەلای خوا بریتیە "لەخواپەرستن" ڕەگەزیش بنەما نیە لەلای خوا بۆ نزیک بونەوە یان سزادانی کەسێک.

If you read Surah Imran Ch.3 Verse No.195 it says 'I will never suffer the loss of any of you, be it male or female, you are companions unto each other'.

ئەگەر سورەتی ال عمران بەشی ۳، ئایەی ژمارە ۱۹٥ بخوێنیتەوە، دەفەرموێت: من کاری هیچ کامتان بەفیڕۆ نادەم چ نێرینە چ مێینە، ئێوە هاوڕێ و هاوکاری یەکترن.

## C- Equal Moral Duties for Men and Women

## یەکسانی ئەرکە ئاکاریەکان بۆ پیاو ئافرەت

I had started my talk by quoting a verse from the Qur'an from Surah Al Ahzab, Ch.33, Verse No.35, which says,

قسەکانم بە ئایەتێکی قورئان دەست پێکرد لە سورەتی الاحزاب بەشی ٣٣، ئایەتی ژمارە ٣٥ کە دەفەرموێت:

'For Muslim men and Muslim women, for believing men and women,for devout men and women,for true men and women, for men and women who are patient and constant,for men and women who give in charity, for men and women who fast and deny themselves, for men and women who guard their chastity, for men and women who engage much in God's praise,God has prepared for them forgiveness and a vast reward.'

بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسوڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخوا ترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك و ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێ بوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە(هەر کە دنیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن).

This verse indicates that the spiritual duties, the moral duties, for the men and women in Islam are the same - Both have to believe, both have to pray, both have to fast, both have to give in charity, etc, etc. But the women have been given certain concession in Islam.

ئەو ئايەتە وا نیشاندەدات کە ئەرکە گیانی و ئاکاریەکان بۆ پیاوان و ئافرەتان لە ئیسلامدا وەکو یەکن- هەردوکیان دەبێ باوەڕدارین، هەردوکیان دەبێ نوێژبکەن، هەردوکیان دەبێ ڕۆژو بگرن، هەردوکیان دەبێ خێرۆمەند بن هتد. بەڵام لە ئیسلامدا ئافرەتان بەخشراون.

If she is undergoing her menstrual period or pregnancy, she does not have to fast - She can keep those fasts later on, when she is more healthy.

ئەگەر ئافرەت لەماوەی بێنوێژی مانگانە یاخود لەماوەی سکپڕبوندا دابوو، پێویست ناکات ڕۆژو بگرێت- دەتوانێت ئەو ڕۆژوانە دواتر بگرێت، کاتێک تەندروستی باشتر بوو. بۆی گونجا

During the menstrual period and during the postnatal period, she needs not pray also - she has been given the concession, and neither does she have to compensate it later on.

لەماوەی بێنوێژیدا و لەماوەی منداڵبوندا، پێویست ناكات نوێژ بكات- ئەم بەخشینەی پێدراوە، و پێویستیش ناكات دووبارە بیان كاتەوە

Just because the moral duties of the men and women are equal in Islam will you call such rights in Islam as modernizing or outdated?

تەنیا لەبەر ئەوەی ئەركە ئاكاریەكانی ئافرەتان و پیاوان لە ئیسلامدا یەكسانن. تۆ لە ئیسلامدا بەم جۆرەمافانە دەڵێیت مافی هاوچەرخ یاخود كۆنەپەرست. ..!!؟

# 2- Economical Rights to the Women

## مافه‌ئابور یه‌كانی ئافره‌ت

Islam gave economical rights to the women 1,300 years before the West. An adult Muslim woman can own, she can dispose or disown any of her property without consulting any one, irrespective whether she is married or she is single.

ئیسلام به ١٣٠٠ ساڵ به‌ر له رۆژئاوا مافه ئابوریه‌كانی داوه به ئافره‌ت. ئافره‌تی موسوڵمانی پێگه‌یشتوو ده‌توانێت ببێت به خاوه‌نی پاره، ده‌توانێت سامانه‌كه‌ی به‌كاربهێنێت یان ده‌ست به‌رداری بێت به‌بێ ئه‌وه‌ی راوێژ به‌كه‌س بكات. په‌یوه‌ندی به‌ئه‌وه‌وه نیه كه شوی كردبێت یان نا.

In 1870, it was the first time in England, that the West recognized the rights of the married woman, where she was allowed to own or dispose any of her property without consultation.

ساڵی ١٨٧٠، یەکەمین ساڵ بوو لە ئینگلتەرا، کە ڕۆژئاوا دەرکی بە مافە ئابوریەکانی ئافرەتی شوکردوو کرد، کە دەتوانێت ببێت بە خاوەنی سامان یان بەکاریبهێنێت بەبێ ڕاوێژ کردن.

I do agree that the women were given their economical rights 1300 years ago - these are ancient rights - but the question is – 'are they modernizing or outdated?'

هاوڕام کە ئافرەتان ١٣٠٠ساڵ لەمەوبەر مافە ئابوریەکانیان پێدراوە- ئەمانە مافی کۆنن- بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە – ئایە ئەوانە مافی هاوچەرخن یان کۆنەپەرستن....؟؟؟!!!

# A- Women on Job

# ئافرت لەکاردا

A women in Islam, if she wishes to work she can work - There is no text in the Qur'an or the authentic Hadith which prevents or makes it prohibited for a woman to do any work, as long as it is not unlawful, as long as it is within the preview of the Islamic Shariah, as long as she maintains her Islamic dress code.

ئافرەت لە ئیسلامدا، ئەگەر خوازیاری کارکردن بێت ئەوا دەتوانێت- هیچ دەقێک لە قورئاندا نیە یان لە فەرموودەی صحیحدا کە ڕێگری بکات یان قەدەغەبکات کە ئافرەت کار بکات، بەمەرجێک نایاسایی نەبێت، بەمەرجێک لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامی بێت، بەمەرجێک پارێزگاری لە پۆشاکی (الحجاب) ئیسلامی بکات.

But natural, she cannot take up jobs, which exhibit her beauty and body - Like for example, modeling and film acting, and such kind of jobs.

بەڵام بەسروشتی، ناتوانێت جۆرەکارانێک بکات، کە جوانی یاخود جەستەی دەربخات، بۆنمونە مۆدێل، کاری فیلم، هەندێ کاری تر.

Many of the professions and jobs which are prohibited for the woman are also prohibited for the man, for example serving alcohol, working in gambling dens, doing any unethical or dishonest business. All these jobs are prohibited for both men and women.

زۆرێک لە کارو پیشەکان کە قەدەغەکراون بۆ ئافرەت هەروەها بۆ پیاویش قەدەغەکراون. بۆ نمونە، پیشکەشکردنی خواردنەوە کحولیەکان، کارکردن لە یانەکانی قومار، ئەنجامدانی هەرکارێکی ناپاک و ناڕەوشتی. هەموو ئەم کارانە بۆ هەردوو ڕەگەز نێر- مێ قەدەغەکراون.

A true Islamic society requires women to take up profession such as doctors.We do require female Gynecologists, we do require female nurses, we do require female teachers.

کۆمەڵگەی ئیسلامی ڕاستەقینە داوا لە ئافرەتان دەکات بۆئەوەی هەندێک پیشە بکەن وەکو دکتۆری، ئێمە پێویستمان بە "دکتۆری ئافرەت"هەیە، ئێمە پێویستمان بە پەرستاری ئافرەت هەیە، پێویستمان بە مامۆستای ئافرەت هەیە .

But, a woman in Islam has got no financial obligations- The financial obligation is laid on the shoulders of the man in the family- Therefore she need not work for her livelihood.

بەڵام، ئافرەت لە ئیسلامدا هیچ ئەركێكی دارای لەسەر نیە- ئەركی دارایی لە سەر شانی پیاوە لە خێزاندا- لەبەر ئەوە پێویست ناكات كاربكات بۆ ژیان و گوزەرانی.

But in genuine cases, where there are financial crisis in which both the ends do not meet, she has the option of working .Here too, no one can force her to work - She works out of her own, absolute free will.

بەڵام لە حاڵەتی تایبەتدا، كە قەیرانی دارایی هەیە كە هەردوو كۆتا بەیەكترناگەن، ئافرەت بژاردەی كاركردنی هەیە. لێرەشدا، كەس ناتوانێت پەستانی بخاتەسەر بۆ ئەوەی كار بكات- بۆخۆی كاردەكات بەتەواوی سەربەستە.

As I mentioned earlier, the job should be within the limits of Islamic Shariah and within modesty levels. Besides the professional jobs I mentioned, they can work in industries and small scale factories which are so made that they exclusively employ ladies or have separate sections for gents and ladies staff.

هەروەک پێشتر ئاماژەم پێدا، کارەکە دەبێت لە چوارچێوەی سنوری ئیسلام و ئاستەکانی داوێن پاکیدا بێت، سەرەڕای کارە پرۆفێشناڵەکان کە ئاماژەم پێدان، دەتوانن لەناوچە پیشەسازی وکارگەی بچوک کاربکەن کە تایبەتن بە کارمەندی ئافرەت یان بەشی جیاواز لە خۆدەگرێت بۆ ستافی پیاوان و خانمان.

She can also engage in business and when required, enter into transactions with gents through a Mehram such as her husband, son etc.

هەروەها دەتوانێت سەرقاڵی بازرگانی بێت لە کاتی پێویستدا، بچێتەناو کاروباری بازرگانی . لەگەڵ گەورەپیاوان لە گەڵ مەحرەمی وەک هاوسەری، کوڕی... هیتد.

The best example I can quote is that of Prophet Muhammad's (Pbuh) wife, Khadija (R) who was a very successful businesswoman. She transacted through her husband Prophet Muhummad (Pbuh). Women can work in their own houses by taking up tailoring, embroidery, pottery, basket-making, etc

باشترین نمونە بریتیە لە خێزانی پێغەمبەر خەدیجە "ڕەزای خوای لێبێت" کە ئافرەتێکی بازرگانی سەرکەوتوو بوو، لەگەڵ هاوسەرەکەی"پێغەمبەر"-"سەلامی خوای لەسەربێت" کاروباری بازرگانی کردوە. ئافرەتان دەتوانن لەماڵەکانی خۆیاندا کاربکەن وەک، بەرگدوری، نەخش و نیگار، کاری گۆزەو دیزە، دروست کردنی سەبەتە... هیتد

## B- Financial Security for Women

## ئاسایشی دارایی بۆ ئافرەتان

A woman in Islam has been given more financial security, as compared to the man. As I told you earlier, the financial obligation is not put on her shoulder - It is put on the shoulder of the man in the family. It is the duty of the father or the brother, before she is married and the duty of the husband or the son, after she is married to look after her lodging, boarding, clothing and financial aspects of her.

لەئیسلامدا ئافرەت ئاسایشی دارایی زیاتری پێدراوە، هەروەک بەراورد کراوە لەگەڵ پیاو. هەروەک پێشتر پێم گوتیت، ئەرکی دارایی لەسەر شانی ئافرەت دانەنراوە- ئەوە لەسەرشانی پیاوە لە خێزاندا. ئەوە ئەرکی باوکە یان برایە، پێش ئەوەی شوبکات، دوای ئەوەی شویکرد ئەرکی مێردە یان کوڕە بۆئەوەی چاودێری پۆشاک و بەرگ و ماڵ و خواردن و شێوە داراییەکانی بکات .

# *C- Compulsory Marital Gift for a Woman*

# مارەیی ئافرەتان ناچاریە

When she gets married, she is on the receiving end. She receives a gift - she receives a dower or a marital gift, which is called as 'Meher'. And it is mentioned in the Qur'an in Surah Nisa, Ch.4 Verse No.4 which says, 'Give to the woman in dower, a marital gift'.

کاتێک ئافرەت شودەکات، لەکۆتایی نزیک دەبێتەوە، دیاری وەردەگرێت، مارەی وەردەگرێت یان دیاری شوکردن وەردەگرێت، کە پێی دەوترێت "مهر". ئەمە لە قورئاندا لە سورەتی النساء بەشی٤، ئایەتی ژمارە٤، ئاماژەی پێکراوە کەدەفەرموێت، مارەی و بەخشی ئافرەتان بدەن.

For a marriage to solemnize in Islam, 'Meher' is compulsory.But unfortunately in our Muslim society here, we just keep a nominal 'Meher' to satisfy the Qur'an, say 151 Rupees, or some people give 786 Rupees and they spend lakhs and lakhs of Rupees on the reception, on the decoration, on the flowers, on the lunch parties, on the dinner parties.

هاوسەرگیری بەپێ داب و نەریتی ئیسلام، مارەی شتێکی واجبە، بەڵام بەداخەوە لە کۆمەڵگەی ئێمەی موسوڵمانی ئێرەدا، ئێمە تەنیا مارەییەکی ڕوکەشانە دەکەین بۆ قایلکردنی قورئان، دەڵێین ١٥١ ڕوپیە یان هەندێ خەڵک ٧٨٦ ڕوپیە دەدەن ئەوان سەدان هەزار ڕوپیە خەرجدەکەن لە پێشوازی کردندا، لە ڕازاندنەوەدا، لە گوڵدا، لە ئاهەنگی نیوەڕۆ و ئێواراندا.

In Islam, there is no lower-limit, nor is there an upper limit for 'Meher' - But when a person can spend lakhs of Rupees on the reception, surely the 'Meher' should be much more.

لە ئیسلامدا، سنوری کەمتر نیە، نە سنورێکی زیاتر بۆ "مارەی" بەڵام کاتێک کە سێک دەتوانێت سەد هەزار ڕوپیە لە پێشوازی خەرج بکات، بەدڵنیاییەوە دەبێت "مارەی" زیاتر بێت.

There are various cultures which have crept into the Muslim societies, especially in the Indo-Pak area. They give a small amount of 'Meher' and they expect the wife to give a fridge, to give a T.V set, they expect the wife to give an apartment, to give a car, etc., and a large sum of dowry, depending upon the status of the husband.

چەندان کەلتور هەن کە هاتونەتە ناو کۆمەڵگەی موسوڵمانانەوە، بەتایبەتی لە ناوچەی "ئیندۆ پارک". ئەوان بڕێکی کەمی " مارەی" دەدەن و چاوەڕێی خێزانیان دەکەن کە ئامێری سارد کەرەوە، تەلەفزیۆنیان پێبدەن، چاوەڕوان دەکەن ژنەکە باڵەخانەیان پێبدات، سەیارەیان پێبدات هیتد، زەحمەتێکی مادی قورس لە لەسەر باری مێردەکە دەوەستێت.

Women do not have to give any dowry to men and men do not have any right to ask or demand dowry from women. The dower given by man to woman during marriage is known as Meher and is a compulsory requirement,

پێویست ناکات ئافرەت مارەی بدات بە پیاو، پیاو هیچ مافێکی نیە بۆ ئەوەی فەرمان یان داوای مارەی لە ئافرەت بکات. لە هاوسەرگیریدا لەلایەن پیاوەوە مارەی دەدرێت بە ئافرەت کە پێی دەوترێت"مهر" ئەوەش پێویستیەکی قسە لەسەر نەکراوە.

If he is a graduate, they may expect 1 lakh - If he is an engineer they may expect 3 lakhs - If he is a doctor they may expect 5 lakhs. Demanding dowry from the wife, directly or indirectly is prohibited in Islam.

ئەگەر زانکۆی تەواو کردبێت پێشبینی یەک لاک دەکەن- ئەگەر ئەندازیار بێت پێشبینی سێ لاک دەکەن- ئەگەر دکتۆر بێت پێشبینی پێنج لاک دەکەن، داواکردنی " مارەی" لە ژن، بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئەوە لە ئیسلامدا ڕێگە پێنەدراوە.

In Islam it is just the opposite of what the Hindu Culture ordains in respect of dowry. Islam requires that the man gives dower to the woman according to his economical condition.

ئیسلام پێچەوانەی ئەوەیە کە کەلتوری هیندۆس داوای دەکات لە مارەیدا. ئیسلام داوا لە پیاو دەکات کە مارەی بدات بە ئافرەت بە پێی باری دارای.

If the parents of the girl give the girl something out of their own free will, it is accepted - But demanding or forcing directly or indirectly, it is prohibited in Islam.

ئەگەر دایک و باوکی کچێک شتێک بدەن بە کچەکەیان بەویستی خۆیان، ئەمە قبوڵە- بەڵام داواکردن و پەستان خستنەسەر ڕاستەو خۆ یان ناڕاستەو خۆ، لە ئیسلامدا ڕێگە پێنەدراوە .

# D-No Financial Liabilities

## ئافرەت بەرپرسیاریەتی دارایی لە ئەستۆ نیە

If a Woman works, which she does not have to- whatever earning she gets, it is absolutely her property. She need not spend on the household- if she wants to spend it is her free will.

ئەگەر ئافرەتێک کاربکات، کە پێویست ناکات- هەرچیەک کە بەدەستی دەهێنێت، بێگومان سامانی خۆیەتی. پێویست ناکات لە ماڵدا خەرجی بکات، ئەگەر ویستیشی سەرفی بکات ئەوە ویستی خۆیەتی.

Irrespective how rich the wife is, it is the duty of the husband to give lodging, boarding, clothing and look after the financial aspects of the wife.

پەیوەندی نیە کە چەند ژنەکە دەوڵەمەندە، ئەوە ئەرکی مێردە بۆ رگ و پۆشاک کرین هەروەها چاودێری دابینکردنی نیشتەجێبوون، بە کردنی بارە داراییەکانی هاوسەرەکەی.

In case of divorce or if a wife gets widowed, she is given financial support for the period of 'Iddah' - and if she has children, she is also given child support.

لە حاڵەتی تەڵاقدا یان ئەگەر ژنێک ببێت بە بێوەژن، ئەوا هاوکاری دارایی دەدرێتێ بۆماوەی "عیددکەی"- هەروەها ئەگەر منداڵی هەبوو، ئەوا هاوکاری منداڵەکەشی دەدرێتێ.

## *E- Right to Inherit*

## مافی میرات

Islam gave the right to the women to inherit, centuries ago. If you read the Qur'an - in several verses, in Surah Nisa, in Surah Baqarah and in Surah Maidah, it is mentioned that a woman, irrespective she is a wife or she is a mother, or a sister, or a daughter, she has a right to inherit. And it has been fixed by God Almighty in the Qur'an.

ئیسلام مافی میراتی بە ئافرەتان داوە، چەندان سەدە لەمەو بەر. ئەگەر قورئان بخوێنیتەوە- لە چەندان ئایەتدا، لە سورەتی النساء دا ، لە سورەتی البقرە هەروەها لە سورەتی المایدە، ئەوە ئاماژەی پێکراوە کە ئافرەت، پەیوەندی نیە کە ژن بێت یان دایک یان خوشک یان کچ ئەوا مافی میراتی هەیە، ئەوەش لەلایەن خوای گەورەوە لە قورئاندا جێگیر کراوە.

# 3- Social Rights of Women in Islam

# مافه كۆمەڵایەتیەكانی ئافرەت لە ئسلامدا

Broadly it can be categorized into four sub-headings. Social rights given to a daughter, to a wife, to a mother and to a sister.

بەگشتی مافە كۆمەڵایەتیەكانی ئافرەت دەتوانرێت پۆلێن بكرێن بۆ چوار ناونیشانی لاوەكی. مافە كۆمەڵایەتیەكان دراون بە كچ، ژن ، دایك . خوشك

# A-Social Rights to a Daughter

## مافە کۆمەڵایەتیەکانی کچ

Islam prohibits female infanticide. The killing of female children is forbidden in Islam. It is mentioned in Surah Taqveem, Ch. 81, Verse No. 8 and 9, 'when the female child is buried alive and when she questions you, for what crime was she killed'.

ئیسلام کوشتنی منداڵی ساوای مێینە قەدەغەدەکات، کوشتنی منداڵە مێینەکان لە ئیسلامدا قەدەغەیە. ئەمەش لە سورەتی التکویر بەشی ٨١ ئایەتی ژمارە "٨-٩" باسکراوە کاتێك کچی زیندەبەچاڵکراو پرسیاری لێدەکرێت لە بەرچ گوناهێك.

Not only female infanticide has been prohibited, all sorts of infanticides have been prohibited in Islam, whether it be a male child or a female child.

تەنها کوشتنی منداڵی مێینە قەدەغە نەکراوە، هەموو جۆرەکانی منداڵ کوشتن قەدەغەکراون لە ئیسلامدا، جا ئەگەر منداڵی نێر بێت یان مێ.

It is mention in the Qur'an in Surah A'nam Ch.6, Verse No.151 that, 'Kill not your children for want of sustenance for it is God that will provide sustenance for you and for children'.

ئەوەش لەقورئاندا ئاماژەی پێدەکرێت سورەتی (الانعام) بەشی ٦ ئایەتی ژمارە ١٥١ منداڵانی خۆتان لەبەر برسێتی و نەداری مەکوژن، چونکەئێمەرزق و رۆزی ئێوەش و ئەوانیش دەدەین.

A similar thing is mentioned in Surah Isra, Ch.17 Verse No.31 which says... 'Kill not your children for want of sustenance, for it is God that will provide sustenance to you and your children, for killing of children is a major sin'.

بە هەمان شێوە لە سورەتی اسراء بەشی ١٧ ئایەتی ژمارە ٣١ دەفەرموێت... نەکەن منداڵەکانتان لەترسی گرانی و برسێتی بکوژن (چونکەپەروەردگارتان رۆزی بەخش و میهرەبانە)، ئێمەرزق و رۆزی دەبەخشین بەوانیش و بەئێوەش، چونکەبەراستی کوشتنی ئەوان گوناە و تاوانێکی زۆر گەورەیە.

In the pre-Islamic Arabia, whenever a female child was born mostly she was buried alive. Alhamdullillah, after the spread of Islam this evil practice has been discontinued.

لە نیمچە دورگەی عەرەبی پێش ئیسلام، هەرکاتێک منداڵێکی مێینە لەدایک بوبا بە زیندووی زیندەبەچاڵ دەکرا. سوپاس بۆخوا، دوای بڵاوبونەوەی ئیسلام ئەم کارە ئەگریسە ئەما"کۆتایی هات"

But unfortunately it still continues in India - According to a BBC report, in the program assignment the title of which was ‘Let Her Die’, there was a British reporter by the name of Emily Beckenen, who came all the way from Britain to India to give us the statistics of the female infanticide.

بەڵام بەداخەوە هێشتا لە هیندستان ئەمە بەردەوامە- بەپێی ڕاپۆرتی "بی بی سی" ناونیشانی بەرنامەکە بریتی بوو لە "لێگەڕێ بابمرێ" پەیامنێرێکی بەریتانی بەناوی "ئێملی بیکێنن" کە لە بەریتانیاوە هاتبوو بۆ هیندستان بۆئەوەی ئامارەکانی کوشتنی منداڵی مێینەمان پێبدات.

In that program, it gives the statistics, that every day more than 3,000 fetuses are being aborted on being identified that they are females. If you multiply this figure by the number of days, that is multiplied by 365, you get a figure of more than one million female fetuses are being aborted every year in our country.

لەو بەرنامەیەدا، ئامارەكان دەخرێنەڕوو، هەموو ڕۆژێک زیاتر لە ٣،٠٠٠ كۆرپەلە لەبار دەبردرێن لەبەرئەوەی پێناسەدەكرێن كە ئەوان مێینەن. ئەگەر ئەم ژمارەیە لێكدانی ژمارەی ڕۆژەكان بكەی، كە ٣٦٥ ڕۆژە، ژمارەیەكت دەست دەكەوێت كە زیاتر لە یەک ملیۆن كۆرپەلەی مێینە لەبار دەبردرێن لە وڵاتەكاماندا "هندیستان"

And there are big hoarding and posters in states like Tamil Nadu and Rajasthan, which says spend 500 Rupees and save 5 lakh Rupees. What does it mean? - That spend Rupees 500 on medical examination like Ultra Sonography, and identify the gender of child.

پۆستەر و تابلۆی پڕوپاگەندە لە ویلایەتەكانی "تامل نادو"- "ڕاجستان" هەن كە دەڵێت..٥٠ ڕوپیە خەرجكە و ٥ سەدهەزار ڕوپیە پاشەكەوت كە. ئەمەش واتای چیە؟ - ٥٠٠ ڕوپیە خەرجكە لە فەحسی پزیشكی وەكو سۆنار و ڕەگەزی منداڵەكە دیاری كە.

If it is a female you can abort it and you'll save 5 lakh Rupees - How? The couple of lakhs you spend on upbringing her and the remaining lakhs of Rupees you spend on giving dowry to the man who will marry her (a custom in India).

ئەگەر مێینە بوو دەتوانیت لەباری بەری و (٥لاک ڕوپیە) پاشەکەوت کەیت- چۆن؟ ئەو دوو پێنج سەد هەزارەی تۆ خەرجی دەکەیت لە پەروەردەکردنی ئەو و مانەوەی چەندەها ڕوپیە کە خەرجی دەکەیت لە مارەیی ئەو پیاوەی کە هاوسەرگیری لە گەڵ دەکات " نەریتی هندستان"

According to the report of the Government Hospital of Tamil Nadu – 'out of every 10 female children that are born, four are put to death' - No wonder the female population in India is less than the male population.

بەپێی ڕاپۆرتێکی نەخۆشخانەی تامیل نادوی حکومی هەر لە دە منداڵی مێینە کە لە دایک دەبن، چواریان دەکوژرێن- کە سیش ناپرسێت کە دانیشتوانی مێینەی هندستان کەمترن لە دانیشتوانی نێرینە.

Female infanticide was continuing in India since centuries - If you analyze the statistics of the 1901 census, for every 1000 males there were 972 females. According to the 1981 statistics and census, it tells you for every 1000 males you have 934 females.

کوشتنی مێینە بۆ ماوەی چەند سەدەیەک بەردەوامە- ئەگەر ئامارەکانی ژمارەی دانیشتوانی ساڵی ۱۹۰۱ شیبکەیتەوە، بۆ هەر ۱۰۰۰ نێرینەیەک ۹۷۲ مێینە هەبووە. بەپێی ئامارەکانی ۱۹۸۱ و ژمارەی دانیشتوان، پێت دەڵێت بۆ هەر ۱۰۰۰ نێرنەیەک ۹۳٤ مێێنەت هەبووە.

And the latest statistics of 1991 tells you that for every 1000 males you have 927 females. You can analyze that the female ratio is dropping every year - And since science and medicine has advanced, it has helped in this evil practice.

دواین ئاماری ۱۹۹۱ پێت دەڵێت بۆهەر ۱۰۰۰ نێرینەیەک ۹۲۷ مێینەت هەبوە. دەتوانیت شیبکەیتەوە کە کە تێکڕای مێنیە کەمدەکاتەوە هەموو ساڵێك- لەوکاتەی کە زانست و دەرمان پێشکەوتووە یارمەتی ئەم کارە نەگرسەی داوە.

Just because Islam tells you that you should not kill any children whether it be male or female will you call these rights in Islam as modernizing or outdated?

تەنها لەبەر ئەوەی ئیسلام پێت دەڵێت نابێت هیچ منداڵێک بکوژیت، جا نێر بێت یاخود مێ تۆ لە ئیسلامدا بەم مافانە دەڵێیت مافی سەردەم یان کۆنەپەرست.؟؟؟!!!

Qur'an not only prohibits female infanticide, it rebukes at the thought of you rejoicing at the birth of a male child and getting saddened at the birth of a female child.

قورئان تەنها کوشتنی منداڵی مێینە قەدەغەناکات، قورئان هەڕەشە لەبیری دڵخۆشبوون بە لەدایک بوونی منداڵی نێرینە و غەمباربوون بە لەدایک بوونی منداڵی مێینە دەکات.

Surah Al-NahlChapter 16, Verses 58 and 59

"When news is brought to one of them of (the birth of) a female (child), his face darkness, and he is filled with inward grief! With shame does he hide himself from his people,

سورەتی النحل بەشی ١٦، ئایەتی ژمارە ٥٨-٥٩ خوا دەفەرموێت:
کاتێک مژدەی بون بە کچ بۆ یەکێک لە وانە "**نەفامەکان**" هاتبا ناوچاوانیان تاریک و گرژ دەبوو و سینەی پڕ دەبوو لە پەژارە،

because of the bad news he has had! Shall he retain it on (sufferance) the choice they decide on?"

له شەرما خۆی دەشاردەوە لەبەر ئەو هەواڵە خراپە، ئایە بیهێ لێتەوە یان زیندە بەچاڵی بکات "ئەوەبکات کە خەڵک بڕیاری لەسەر دەدەن"

According to an authentic hadith related in Ahmed, Prophet Muhammad (Pbuh) said, "Anyone who brings up two daughters properly they will be very close to me on the day of Judgment."

بەپێی فەرمودەیەکی صحیح کە امامی احمد ڕیوایەتی کردوە، پێغەمبەر"سەلامی خوای لەسەر بێت" فەرمویەتی: هەرکامێکتان دوو کچ پەروەردەبکات بە تێر و تەواوی ئەوا لەڕۆژی دوایی زۆر لەمن نزیک دەبێت.)... (یان دەفەرموێ لەگەڵ منەلەبەهەشت)

According to another hadith whoever brings up two daughters properly and treats them kindly and justly shall enter paradise.

هەر بەپێی فەرمودەیەکی دیکە، هەرکامێک لە ئێوە دوو کچ بە تێر و تەواوی پەروەردەبکات و بە میهرەبانی و دادوەریەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە.

In Islam, a daughter should be brought up correctly. In Islam, there should be no partiality in upbringing of the daughter or the son.

لەئیسلامدا،دەبێت کچ بەڕێکوپێکی پەروەردەبکرێت.لەئیسلامدا نابێت هیچ جیاكاری "لایەنگری" لەپەروەردەکردنی کچ یان کوڕدا بکرێت.

According to a Hadith, 'In the presence of the Prophet Muhammad, once a man kissed his son and placed him on his lap but did not do the same to his daughter. The Prophet immediately objected and said that you are unjust - You should have even kissed your daughter and placed her on the other lap'.

بەپێی فەرموودە، لە سەردەمی پێغەمبەردا، جارێکیان پیاوێک کوڕەکەی ماچ کرد و لە باوەشی خۆی کرد بەڵام هەمان شتی بۆ کچەکەی نەکرد. یەکسەر پێغەمبەر بەرهەڵستی کردوو گوتی تۆ نادادپەروەر بووی– دەبوایە کچەکەشت ماچ کردباو لە باوەشی خۆت کردبا.

# B- Social Rights to Wife

# مافەكۆمەڵایەتیەكانی هاوسەر" خێزان"

All the previous civilizations, they have considered the women to be an 'instrument of the devil'.The Qur'an refers to the women as 'Mohsana', that is a 'fortress against the devil'.

سەرجەم شارستانیەكانی پێشوو، وایاندانابوو كە ئافرەت"ئامرازێكی شەیتانی" بووە، قورئانیش ئاماژە بە ئافرەت دەكات وەك" محصنه" كە "قەڵایەكە دژی شەیتان"

And if a woman, who's good, marries a man, she prevents him from going on the wrong path.There's a Hadith in which Prophet Muhammad (peace be upon him) he said that, 'there is no monasticism in Islam'.

ئەگەر ئافرەتێك باش بێت، هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێك بكات، ناهێڵێت پیاوەكەی لەڕێگای چەوت بەردەوام بێت. لێرەدا فەرموودەیەك هەیە كە پێغەمبەر"صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی..... ('ڕەبەنی لەئیسلامدا بوونی نیە').

And again according to Sahih Bukhari, Volume No. 7, Ch. No. 3 Hadith No 4 it says that 'the Prophet Muhammad ordained the young men, all those who have the means to marry, they should marry - For it will help them to guard their gaze and guard their modesty.

دوباره بەپێی صحیحی البخاری جلدی ژماره ٧، بەشی ژماره ٣، ژمارەی فەرمووده ٤ دەفەرموێت، پێغەمبەر"محمد" فەرمانی بە گەنجەکان داوه، هەموو ئەوانەی هۆو وەسیلەی هاوسەرگیریان هەیە، دەبێ هاوسەرگیری بکەن– ئەمەش یارمەتی دەردەبێت بۆ پارێزگاریکردن له نەزەرو داوێنپاکیان.

Once during a question and answer session somebody asked me does this imply that if I marry twice I will complete my full religion?

جارێکیان له بەشی پرسیارو وەڵامدا کە سێک پرسیاری لێکردم، ئەوە وانیشان دەدات ئەگەر دوجار هاوسەر گیری بکەم ئەوا ئیمانم تەواو دەبێت؟

The Prophet (Pbuh) considered marriage for a Muslim as half of his religion because it shields him from promiscuity, fornication, homosexuality, etc, which add to half the evil in society.

پێغەمەبەر"سەلامی خوای لەسەر بێت" هاوسەرگیری بۆ موسوڵمان بە نیوەی دین داناوە چونکە لە بەدڕەوشتی، زینا و نێربازی، دەت پارێزێت، هتد. کە نیوەی کاری نەگریس لە کۆمەڵگادا لەوانەوەسەرچاوەدەگرێت.

Secondly, only after you marry do you have an opportunity to become a husband or wife, a father or a mother and thus perform your duties as either as a husband or as a wife; as a father or as a mother. Whether you marry once or twice you are yet fulfilling only half your Deen.

پاشان، لەدوای ئەوەی هاوسەرگیری دەکەیت دەرفەتی ئەوەت هەیە ببی بە مێرد یان ژن، باوک یان دایک، بەو شێوەیەش ئەرکەکانت وەک مێرد یان ژن یان وەک باوک یان دایک بە جێدەهێنیت. ئەگەر جارێک هاوسەرگیری بکەیت یان دوجار ئەوا تەنیا بەشێک لە دینەکەت بەجێ دەهێنی.

The Qur'an say's that, 'We have put love into the hearts of the husband and wife'.If you read Surah Rum, Ch. 30, Verse No. 21 it says that, 'And amongst our signs We have created for you mates or companions, so that you may dwell in them in tranquillity and we have put love and mercy between your hearts'.

قورئان دەفەرموێ ،" ئێمە ئەوینمان خستۆتە دڵی ژن و مێردەوە" ئەگەر سورەتی الروم بخوێنیتەوە بەشی ٣٠، ژمارەی ئایەت ٢١ دەڵێت لە نێوان نیشانەکانماندا: ئێمە دروستمان کردووە بۆ ئێوە هاوڕێ یاخود هاوسەر بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە.

According to Surah Nisa, Ch.4, Verse No.21, marriage is considered as a strong agreement, a strong contract. According to Surah Nisa, Ch.4, Verse No.19, it says,

بەپێی سورەتی النساء بەشی ٤، ئایەتی ژمارە ٢١، هاوسەرگیری وەکو رێککەوتنێکی بەهێز ، پەیوەندیەکی بەهێز دانراوە. هەربەپێی سورەتی النیساء ئایەتی ژمارە ١٩ دەڵێت،

'You are prohibited to inherit women against their will' - Means, to marry the permission of both the parties are required.

مافتان نیە "قەدەغەیە" ئافرەتان بکەنە میراتی خۆتان لەدەرەوەی ویستی خۆیان– واتە، بۆهاوسەرگیریکردن ڕەزامەندی هەردولا پێویستە.

It is compulsory that the man and woman both should agree to marry. No one - not even the father can force their daughter to marry against her wishes.

ئەوە پێویستە کە پیاو و ژن هەردوکیان ڕەزامەندیان لەسەر هاوسەرگیریەکەیان هەبێت. هیچ کەس–تەنانەت باوک ناتوانێت هێز بخاتە سەر کچەکەی بۆئەوەی لەدەرەوەی ویستی خۆی شووبکات.

There's a Hadith in Sahih Bukhari, Volume 7, Book 62, Number 69, which says 'that a lady she was forced by her father to marry against her wishes' - And she went to the Prophet and the Prophet invalidated the marriage'.

فەرموودەیەک لە صەحیحی البخاریدا هەیە، جلدی ٧، ژمارە ٦٩، دەڵێت "خانمێک لەلایەن باوکیەوە زۆری لێکرا بۆئەوەی هاوسەرگیری بکات بە پێچەوانەی ویستی خۆی– پاشان ڕۆیشتە لای پێغەمبەر، پێغەمبەریش هاوسەرگیریەکەی هەڵوەشاندەوە.

Another Hadith in Ibn-e-Humbal, Hadith No. 2469, it says 'that a daughter was forced by her father to get married - And when the daughter approached the Prophet, the Prophet said you can either continue, or if you wish you can invalidate the marriage.

فەرموودەکی دیکە لە ابن حەمبەلەوە، ژمارەی حەدیث ٢٤٦٩، دەڵێت، کچێک لەلایەن باوکیەوە زۆری لێکرا بۆئەوەی شوبکات کاتێک کچەکە بە پێغەمبەر گەیشت، پێغەمبەر گوتی یا ئەوەتا دەتوانی بەردەوام بی، یان ئەگەر خوازیاریت دەتوانیت هاوسەرگیریەکەت هەڵبوەشێنیتەوە.

In another version, the girl said: "Actually I accept this marriage but I wanted to let women know that parents have no right (to force a husband on them)" (Ibn-Maja, No.1873).

لە حاڵەتێکی دیکەدا، کچەکە گوتی: لە ڕاستیدا هاوسەر گیریەکەم قبوڵ کرد بەڵام ویستم ئافرەتانی تر بزانن کە باوکان ودایکان مافیان نیە کچان بەزۆر بە شووبدەن، ابن ماجە، ژمارە.١٨٧٣ "

That means, the consent of both the male and the female is required. In Islam, a woman is considered as a homemaker - She is not considered as a housewife, because she is not married to the house.

ئەوەش بەمانای، ڕەزامەندی هەردوكیان"نێر-مێ" پێویستە. لە ئیسلامدا، ئافرەت بە بەڕێوەبەری ماڵ دادەنرێت- وەكو ژنی ماڵ دانانرێت، چونكە ئەو ئافرەتە هاوسەرگیری لە گەڵ ماڵ نەكردوە.

Many people use terminology, without understanding what it means – 'Housewife' means 'you are the wife of the house'. So I believe, from now onwards the sisters would prefer calling themselves 'homemakers', than 'house wives', if they are occupied more in the home

زۆر كەس ئەو زاراوە بەكاردەهێنێت، بەبێ ئەوەی تێبگات واتاكەی چیە- "هاوس وایف" واتە، ژنی ماڵەوە". بۆیە بڕوام وایە، لەئێستا بەدواوە خوشكان بەخۆیان بڵێن "بەڕێوەبەری ماڵ" لەجیاتی " ژنی ماڵەوە" ئەگەرفەوان دەسەلاتیان زیاتر بێت لەماڵەوە.

In Islam, a woman, she is not married to a master that she should be treated like a slave - She is married to it is equal. And there is a Hadith which says in Ibn-Hambal - Hadith No 736, 7396. It says that, 'the most perfect of the believers are those that are best in character and behavior, and those that are best to their family and their wives'.

لە ئیسلامدا، ئافرەت، هاوسەرگیری لەگەڵ گەورەیەک نەکردووە کە وەک کۆیلە مامەڵەی لەگەڵ بکات- هاوسەرگیری لەگەڵ هاوتاکەی کردوە. لەم بارەشەوە فەرموودە یەک هەیە دەفەرموێ/ لە ابن حەمبەلەوە- فەرموودەی ژمارە ٧٣٦،٧٣٩٦ کامڵترین بڕواداران ئەوانەن کە باشترینن لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاردا و ئەوانەی کە باشترینن لەگەڵ خێزانەکانیان و هاوسەرەکانیاندا.

Islam gives equal rights to the man and woman. Qur'an clearly mentions that men and women, husband and wife have equal rights in all aspects, except leadership in the family.

ئیسلام مافی یەکسان دەدات بەپیاو ئافرەت. قورئانیش بەڕونی ئاماژە بەئەوە دەکات، بەهەموو شێوەیەک، پیاوان و ئافرەتان- ژن و مێرد مافی یاکسانیان هەیە، جگە لە ڕابەری لە خێزاندا.

It is mentioned in the Qur'an in Surah Baqarah Ch.2, Verse No.228. It says that, '...the women have been given rights similar against them (men) on equitable terms but the men have a degree higher...'.

ئەمش لە قورئاندا لە سورەتی البقره بەشی ٢، ئایەتی ژمارە ٢٢٨باسکراوە .دەڵێت،... ژنان و پیاوان ماف وەکو یەکیان هەیە بەڵام پیاوان پلەیەکیان بەرزترە ...

Most of the Muslims have misunderstood this verse, when it says 'men have a degree higher' - As I said we should analyze the Qur'an as a whole. And its mentioned in Surah Nisa, Ch. 4, Verse No.34 which says, 'The men are the protectors and maintainers of the women, for God has given one of them more strength than the other because they give them their means'.

زۆرترین موسوڵمان بەهەڵە لەم ئایەتە تێگەیشتوون، کاتێک قورئان دەفەرموێت "پیاوان پلەیەکیان بەرزترە "-!!! هەروەک گوتم پێویستە ئێمە هەموو قورئان شی بکەینەوە. ئەمەش لە سورەتی النیساء دا باسکراوە بەشی ٤، ژمارەی ئایەت ٣٤، پیاوان پارێزەرو پشتیوانی ئافرەتانن، خوا هێزی زیاتری بە یەکێکیان بە خشیوە لەوەی تر بە هۆی ئەوەی پیاوان لە سامانەکانیان خەرج دەکەن و پارمەتان دەدەن.

People say the word 'Qawwam' means, 'one degree higher in superiority' - But actually the word 'Qawwam' comes from the root word 'Iqama'. 'Iqama' means for example 'when you give the Iqama before prayers - You stand up'.

خەڵک وشەی زۆربەتوانا "قوام" دەڵێن، بەواتای پلەیەک بەرزتر لە "پلەوپایە "– بەڵام لەڕاستیدا وشەی "قوام " لە وشەی "اقامه" هاتوە، "اقامه " واتە بۆنمونە " کاتێک قامەت دەکەی لەبەردەم نوێژ خوێنان- تۆهەڵدەستی. ڕادەوەستی.

So 'Iqama' means to standup - so the word 'Qawwam' means one degree higher in responsibility, not one degree higher in superiority. Even if you read the commentary of 'Ibne-Kathir' - He says that the word 'Qawwam' means one degree higher in responsibility, not one degree higher in superiority.

بۆیە ، "اقامه " واتە "هەڵستان"– بۆیە وشەی " قوام" واتە یەک پلە بەرزتر لە "بەرپرسیاریەتیدا"، نەک یەک پلە لە پلەوپایەدا. تەنانەت ئەگەر ڕونکردنەوەی ابن کثیر بخوێنیتەوە – دەڵێت وشەی *"قوام"* واتە پلەیەک بەرزتر لە بەرپرسیاریەتیدا، نەک یەک پلە لە پلەوپایەدا.

And this responsibility, should be carried out by mutual consent of both husband and wife.It is mentioned in Surah Baqarah, Ch.2, Verse No.187, which says, Which means... 'Your wives are your garments, and you are their garments'.

ئەوبەرپرسیاریەتیەش، دەبێت جێبەجێ بکرێت لەلایەن ڕەزامەندی هەردولا "ژن و مێرد". لە سورەتی البقره باسکراوە بەشی ٢ ژمارەی ئایەت١٨٧،دەفەرموێ،هاوسەرەکانتان پۆشاکی ئێوەن و ئێوەش پۆشاکی ئەوان.

What's the objective of garments - It is used to conceal and to beautify. The husband and wife should conceal each other's faults, and they should beautify each other - It's a relationship of hands and gloves. The Qur'an mentions that, 'even if you do not like your wife, you should treat her kindly'.

کاری پۆشاک چیە- بەکاردەهێنرێت بۆ خۆداپۆشین و جوانی. دەبێ ژن و مێرد داپۆشەری هەڵەکانی یەکترین، هەردوکیشیان جوانی بەیەکتر ببەخشن- ئەوە پەیوەندی دەستکێش و دەستە. قورئان ئەمە باس دەکات، تەنانەت ئەگەر تۆ هاوسەرەکەت خۆشنەوێت، دەبێت بە میهرەبانی مامەڵەی لەگەڵ بکەی.

It is mentioned in Surah Nisa, Ch.4, Verse No.19, that, '...consort with them (your wives) in kindness, for if you hate them it may happen that you hate a thing wherein God has placed much good.

لەسورەتی النساء دا ئاماژەی پێکراوە، بەشی٤، ئایەتی ژمارە ١٩ دەڵێت، بەمیهرەبانیەوە ژیانیان لەگەڵ بەسەربەرن، ئەگەر ڕقتان لێبن لەوانەیە ڕقتان لەشتێک بێت کە خوا بەباشی داناوە "بەخێروبێر بۆتان"

Even if you dislike your wife you have to treat her kindly and with equity.

Just because the rights of a wife are equal to those of the husband in Islam, will you call such rights in Islam as modernizing or outdated?

تەنانەت ئەگەر حەزت لەهاوسەرەکەت نەبێت دەبێت بە میهرەبانی و دادپەروەری مامەڵەی لەگەڵ بکەی.

تەنها لەبەر ئەوەی مافەکانی ژن یەکسانن بە مافەکانی مێرد لە ئیسلامدا، ئایە دڵێیت مافەکانی ئیسلام مافی هاوچەرخن یاخود مافی کۆنەپرستن.. ؟؟ !!

There is a system of divorce in Islam which is to be applied only in extreme cases where the problem between the husband and wife is too grave to be solved and the continuation of married life would be counterproductive. The method of divorce is clearly spelt out in the Qur'an in Surah -Al-Talaq in Chapter 65 and in Surah Al-Baqrah Verses 227 to 242.

سیستەمی تەڵاق لە ئیسلامدا تەنیا لەو حاڵەتانەدا جێبەجێ دەکرێت کە کێشەی هەردوولا گەیشتبێتە ئاستێک کە زۆر دژوار بێت بۆچارەسەر کردن. کە بە بەردەوامی ژیانی هاوسەرگیریان زیان بەخش بێت. هەنگاوی تەلاقیش لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە لە سورەتی التلاق بەشی ٦٥، وسورەتی البقرە ئایەتی ١٢٧-١٤٢

According to Prophet Muhammad (Pbuh), among the permissible things in Islam, the most hated in the sight of Allah is divorce. It is as though the heavens shatter (metaphorically).

پێغەمبەر"سەلامی خوای لەسەربێت" دەفەرمێت لە نێوان ئەوشتانەی کە ڕێگەپێدراون لە ئیسلامدا، لە دیدەی خوا خراپترین شت بریتیە لە تەڵاق، وەکو تێکشکاندی ئاسمانەکانە.

## *C- Social Rights to a Mother*

## مافەکۆمەڵایەتیەکانی دایک

The only thing above respect to Mother is the worship of God - It is mentioned in: Ch.17, Verse No.23-24, It says that… 'God has ordained for you, that you worship none but Him, and to be kind to your parents. And if any one or both of them reach old age do not say a word of contempt or repel them but address them with honour, and speak to them with kindness, and lower your wing of humility and pray to God - 'My Lord! Bless them as they have cherished me in childhood'.

تاکە شتێک کەلەسەرووی ڕێزگرتنی دایکە، بریتیە لە پەرستنی خوا- ئەوەش لە سوڕەتی الاسراء بەشی ١٧، ئایەتی ژمارە ٢٣-٢٤، دەفەرموێت.خوا فەرمانی کردووە کەکەس نەپەرستن جگە لەئەو، و میهرەبان بیت لەگەڵ دایک و باوکت، ئەگەر یەکێکیان یان هەردوکیان پیربوون وشەی بێزارکەر یان بەرپەرچیان مەدەنەوە بەڵکو بە ڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، بە میهرەبانیەوە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن، باڵتان بۆ ڕابخە و نزابکەن – خوایەگیان ! ڕەحمیان پێبکە هەروەک ئەوان بە منداڵی منیان پەروەردە کرد.

Surah Nisa, Ch4. Verse No. 1 says, 'Respect the womb that bore you'. Surah A'nam, Ch.6, Verse No.151, says that, 'You have to be kind to your parents'. Surah Luqman Ch.31, Verse No.14, says that, 'We have enjoined on the human beings to be kind to his parents. In travail upon travail, did their mother bore them and in years twain was their weaning'.

سورەتی النیساء بەشی ٤، ئایەتی ژمارە ١،'ڕێز لە و سکە بگرە کە ژیانی بەتۆ بەخشیوە' سورەتی الانعام بەشی شەش، ئایەتی ژمارە ١٥١، دەفەرموێت : میهرەبانبن لە گەڵ دایک و باوکتان. سورەتی لوقمان، بەشی ٣١، ئایەتی ژمارە ١٤، دەفەرموێت: ئێمە فەرمانمان بە مرۆڤەکان کردوە کە لەگەڵ دایک و باوکیان میهرەبان بن، دایکی هەڵی دەگرێت بە دووگیانی( پێی لاواز دەبێت) لاوازی لەدوای لاوازی و بڕینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوساڵیەوە.

A similar thing is repeated again in Surah Ahqaf, Ch.46, Verse No.15, that... 'We have enjoined on the human beings to be kind to his parents. In pain did their mother bore them and in pain did she give them birth'.

دوبارە لەسورەتی الاحقاف، بەشی٤٦، ئایەتی ژمارە١٥، دەڵێت: ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد کردوە کە چاکەکاربن لەگەڵ دایک و باوکیاندا،دایک بەئازارەوە ئەوانی هەڵگرتوە و بەئازارەوە ئەوانی بووە.

According to several authentic hadith including the one narrated in Ahmed and Ibn-e-Majah, “Paradise lies at the feet of the mother”. It does not mean literally, for example that if a mother walks on the road and steps on filth and dirt, it becomes paradise. It means if you respect your mother, obey her, love her and take good care of her, you will Insha Allah enter paradise.

بەپێی چەندان فەرمودەی صحیح کە ئیمامی احمد و ابن ماجە ریوایەتیان کردوون" بەهەشت لە ژێر پێی دایکان دایە" لە واقیعدا بەهەشت لە ژێر پێی دایک دانیە، بۆنمونە ئەگەر ئافرەت بەڕێگادا بڕوات و هەنگاو بنێتە سەر پیسی و پۆخڵی ئەوا دەبێتە بەهەشت، بەواتای، ئەگەر ڕێز لە دایکت بگریت، گوێڕایەڵی بکەی، خۆشت بوێت وئاگاداری بیت، ( ان شاء الله ) دەچیتە بەهەشت.

Another Hadith related in Sahih Bukhari in Volume 8, Hadith No. 2, as well as in Sahih-Muslim - It says that a man asked the Prophet Muhammad… ‘Who requires the maximum love and respect and my companionship in this world?

فەرمودەیەکی دیکە کەپەیوەندیدارە، صحیحی البخاری جلدی ٨، فەرمودەی ژمارە ٢، هەروەها لە صحیحی مسلیمیشدا- دەفەرموێت ، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر کرد... کێ پێویستی بەوپەڕی ئەوین و ڕێزە براکەم لەو جیهانەدا؟

The Prophet replied– 'your mother''Who is next'? – 'your mother' 'Who is next?'– 'your mother' The man asked for the fourth time,- 'Who is next' The Prophet replied 'your father'.

پێغەمبەر وەڵامی دایەوە– "دایکت" پاشان کێ؟- "دایکت" پاشان کێ " دایکت"- پیاوەکە بۆ جاری چوارەم پرسیاری کرد "پاشان کێ؟ پێغەمبەر وەڵامی دایەوە "باوکت "

So 75% of the love and respect goes to the mother and 25% of the love and respect goes to the father. Three fourth of the better part of the love and respect goes to the mother – One fourth of the remaining part of the love and respect goes to the father.

کەواتە لەسەدا ٧٥% ئەوین و ڕێز بۆدایکە و لەسەدا ٢٥ % ی ئەوین و ڕێز بۆ باوکە. سێ لەسەر چواری بەشە باشەکەی ئەوین و ڕێز بۆ دایکە – یەک لەسەر چواری ئەوین و ڕێزی ماوە بۆ باوک.

# D- Social Rights to a Sister

## مافەکۆمەڵایەتیەکان بۆ خوشک

According to Surah Tawbah, Ch. 9, .Verse No.71, it says that, 'The men and the women they are friends of each other'.

بەپێی سورەتی التوبە بەشی ۹، ئایەتی ژمارە۷۱، دەفەرموێت ئافرەتان و پیاوان هاورێی یەکترن

Prophet Muhammed (May peace be upon him) he said, 'The women are

The 'shakaat' -'Shakaat' means sister'.

پێغەمبەر "سەلات و سەلامی خوای لەسەربێت"فەرمویەتی، ئافرەتان "شقیقة"ن – "شقیقة "ش واتە خوشک.

# 4. Educational Rights to a Woman

## مافه پەروەردەییەکانی ئافرەت

The first 5 verses which were revealed in the Qur'an were from Surah Alaq, or Surah Iqra, Verse No. 1 to 5 which says: 'Read, recite or proclaim in the name of your Lord, Who has created the human beings from a congealed clot of blood (a leech like substance).

یەکەمین ئایەت کەلە قورئاندا دابەزی لە سورەتی العلق دا بوو یان سورەی اقرەء، ئایەتی ژمارە 5-1 کەدەفەرموێت: بخوێنە ،بخوێنەوە یان بەناوی خواکەت، کە مرۆڤەکانی دروست کردوە لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو.

Read, your Lord is most bountiful. Who has taught the use of the pen? Who has taught the human beings that which he knew-not'?

بخوێنە، پەروەردگاری تۆ زۆر بەخشندەیە،کە بەهۆی قەڵەمە وە زانست و زانیاری فێرکردوە،مرۆڤ فێری ئەوشتانەکردوە کەنەی زانیوون.

The first guidance given in the Qur'an to the humankind was not to pray, was not too fast, was not to give charity - It was read - Islam pays utmost importance to education.

یەکەمین ئامۆژگاری کەبە مرۆڤەکان دراوە لەقورئاندا نوێژ نیە، ڕۆژو نیە، بەخشین نیە-بریتی بوولە زانست"بخوێنە"ئیسلام ئەوپەڕی گرنگی دەدات بە پەروەردە.

According to Sahih Al-Bukhari, the women at the time of the Prophet (Pbuh) had become so keen to acquire more knowledge that they came to the Prophet (Pbuh) with the following proposal, "You are always surrounded by men for imparting knowledge so appoint a day for us." The Prophet (Pbuh) promised to do so and went to them and taught them. He also sent representatives with messages to enlighten the Muslim women.

لە صحیح البخاری، ئافرەتانی سەردەمی پێغەمبەر زۆر بەگڕوتین بوون بۆ بەدەست هێنانی زانست و زانیاری بەو پێشنیارانە هاتنە خزمەت پێغەمبەر" سەلامی خوای لەسەر بێت" -"هەمیشە لەدەورەی پیاوانیت بۆئەوەی زانیاریان پێ ببەخشی لەبەر ئەمە ڕۆژێکیش بۆئێمە دیاری بکە" پێغمبەریش پەیمانی پێدان ، ڕۆیشت و فێری کردن، هەروەها نوێنەرێکی بۆناردن بەپەیامەوە بۆ ڕوناکبیر کردنی ئافرەتانی موسوڵمان.

# 1. Aisha Bent Abu Bakir

The first and foremost example is that of Aisha, the wife of the Prophet, who lived long after her husband's death and provided great guidance to the first Muslim Community, even to the renowned sahabah and the Khalifah Rashidun. Her pupil, Urwah Ibn Azzubayr, testifies, "I did not see a greater scholar than Aishah in the learning of the Qur'an, obligatory duties, lawful and unlawful matters, poetry and literature, Arab history and genealogy."

عائیشەی کچی ابوبکر

یەکەمین و سەرەکترین نمونە بریتیە لە عائیشە، خێزانی پێغەمبەر، کە ماوەیەک لەدوای مردنی هاوسەرەکەی ژیا، ڕێنماییەکی گەورەی بەخشی بەیەکەمین گۆمەڵگای ئیسلامی، تەنانەت بە هاوەڵە بەناوبانگ و خەلیفەکانی ڕاشیدینیشەوە، قوتابییەکەی" ئەڕوا کچی زوبەیر" شایەتی دادات "هیچ زانایەکم نەبینیوە گەورەتر بێت لە عائیشە لە فێرکردنی قورئان، ئەرکە پێویستیەکان، کێشە یاسایی و نایاساییەکان، سامان، ئەدەب، مێژوی عەرەب هەروەها بۆماوەزانی.

She had profound knowledge of medicine. Whenever foreign delegations came to the Prophet (Pbuh) and discussed various remedies for illnesses, she used to remember them. She was so well versed in mathematics that important Sahabah used to consult her on the problems concerning "mirath" (inheritance) and the calculation of shares.

خاوەنی زانیاری کارگەری پزشکی بووە، هەرکاتێک نوێنەرە بیانیەکان هاتبان بۆلای پێغەمبەر " سەلامی خوای لەسەر بێت " چەندەها چارەسەری نەخۆشی تاوتوێ دەکرد، و ڕاهاتبوو ئەوانی لە بیر بێت. پسپۆڕبوو لە بیرکاریدا هاوەڵە ناودارەکان ڕاهاتبوون ڕاوێژی لەگەڵ بکەن لە کێشەو گرفتەکانی وەک میرات و دابەش کردنی پشک.

Aisha even guided Sahabah who sought her advice on different matters. They included the khalif "Umar" Abdullah Ibn Umar and Abu Hurairah. She was among the great huffaz (memorisers) of Ahadith. She narrated 2210 Ahadith in all.

تەنانەت ڕێنمایی هاوەڵانی کردوە کە بەدوای ئامۆژگاریەکانی دا وێڵن لە بەباتە جیاوازەکاندا، لەوانەش، خەلیفە عمر، عبدالله بن عمر و ابو هورەیرە . لەنێوانی حافیزە گەورەکانی فەرمودەدا بوە، و بە گشتی (٢٢١٠ فەرمودەی گێڕاوەتەوە.)

Abu Musa Al-Ash'ari, himself a famous jurist and learned scholar, says "whenever we, companions of the Prophet Muhammad (Pbuh), encountered any difficulty in the matter of any Hadith we referred it to Aishah and found that she had definite knowledge about it.

ابوموسای ئەشعەری کە خۆی زاناو یاسازان بووە دەڵێت "هەرکاتێک ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر لەهەر فەرمودەیەکدا کێشەیەکمان بۆ دروست بوبا دەچوینە لای عائیشە. دەرکمان پێدەکرد کە زانیاریەکی ڕون و ئاشکرای لەبارەیەوە هەیە"

88 great scholars learnt from her and there were a large number of others. In short she was the scholar of scholars.

٨٨ زانای گەورە لە ئەوەوە فێر بوون و ژمارەیەکی گەورەتر هەن، بەکورتی ،عائیشە زانای زاناکان بووە.

## 2. *Saffiyah, wife of the Prophet (Pbuh)*

صەفیەی خێزانی پێغەمبەر" سەلامی خوای لەسەر بێت"

Saifyyah, the wife of the Prophet (Pbuh), was also very learned in Fiqh. Imam Nawawi says, "She was the most intellectual among learned women".

صەفیەی خێزانی پێغەمبەر" سەلامی خوای لەسەر بێت" شارەزایی لە فیقدا هەبووە، امامی نەوەوی دەڵێت "شارەزاترین کەس بووە لە نێوان ئافرەتاندا"

*3. Umm Salamah: Wife of the Prophet (Pbuh)*

ام سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر" سەلامی خوای لەسەر بێت"

She too was a great scholar. The scholar, Ibn Hajar has given the names of at least 32 scholars who learnt Ahadith from her.

هەروەها ئەویش زانایەکی گەورە بوە، ابن حەجەری زانا بەلایەنی کەمەوە ناوی ٣٢ زانای داوە کە لەئەوەوە فەرمودە فێربوون.

# 4. Faitmah Bint Qays

فاتیمەی کچی قەیس

Fatimah bint Qays was also a scholarly lady in the early days of Islam. Her learning was so deep that she discussed a juristic point with Umar and Aishah for a long time and they could not change or challenge her views. Imam Nawwawi says, "She was one of those who emigrated in the early days and possessed great intellect and excellence."

هەروەها فاتیمەی کچی قەیس خانمێکی زانا بوە لەسەرەتای ڕۆژەکانی ئیسلامدا. شارەزاییەکی قوڵی هەبوو کە کاروباری دادگای لەگەڵ عمر و عایشە تاوتوێ دەکرد بۆماوەیەکی زۆر، نەیان دەتوانی بەرەنگاری لە تێڕوانینەکانی بکەن یان بیان گۆڕن.

امامی نەوەوی دەڵێت: ئەو یەکێک بوە لەوانەی لەسەرەتاوە کۆچی کردوە و بوەتە خاوەنی بیرو هۆشێکی نایاب.

The list of learned women of the early days of Islam shows that women were not kept illiterate and ignorant, but rather were fully encouraged to participate in the process of learning and scholarship. They also knew their rights and responsibilities very well.

ئەولیستەی ئافرەتە شارەزاکانی سەرەتای ئیسلام ئەوە نیشان دەدات که ئافرەت نەزان و نەخوێندەوار نەبووە، بەڵکو زیاتر پڕبوە لە و و دانایی. ردەروەتێکۆشان بۆ بەشداری کردن لە پرۆسەی فێربون وە هەروەها ماف و بەرپرسیاریەتی خۆیان زۆر بەباشی دەزانی.

There were instances to show that some women even challenged great scholars of their times if they said something which was against the rights granted to women by the Qur'an the Sunnah.

نمونەش هەن بۆخستنەڕوو هەندێک ئافرەت تەنانەت بەرەنگاری گەورە زانایانیان کردوە لە کات و سەردەمی خۆیان، ئەگەر شتێکیان گوتبا کە پێچەوانەی مافەکان بوایە کە بە ئافرەت بە خشراون لەلایەن قورئان و سونتەتەوە.

1. Sayyida Nafisa: Grand daughter of Hussein

سيدة نفسية: كچە زای حوسێن

She was a great scholar. A large number of pupils came to her from different places to learn from her. Imam Shafii, founder of the Shafii School of Islamic law, was one of her illustrious pupils.

زانایەکی گەورەبوو. لە شوێنە جیاوازەکاندا قوتابی جیاوەز هاتوون بۆلای بۆ ئەوەی لێیەوە فێربن، امام شافیعی" سەرمەزهەبی شافیعی" یەکێک بووە لە قوتابیە باناو بانگەکانی.

*2. Aisha Bint Sa'd Ibn Abi Waqqas*

عائیشە کچی سعد بن ابی وقاص

She was the daughter of a great Sahabi, Sa'd Ibn Abi Waqqar. She was very learned in Islamic Sciences, to such an extent that Imam Malik, the famous jurist and scholar of Hadith, was her pupil.

کچی هاوەڵێکی گەوورە بەناوی سعد بن ابی وقاص، لە زانستی ئیسلامیدا زۆر شارەزا بوە، وەک نمونەیەک امام مالیک پاسازانی ناودارو زانای فەرموده قوتابی ئەو بوه

❊❊❊

## ❖ *Education is Compulsory in Islam*

## لە ئیسلامدا پەروەردە و فێرکردن پێویستە

According to Quran:

* God will exalt those of you who believe and those who are given knowledge to high degrees. (58:11)

* And say, O my Lord! Increase me in knowledge. (20:114)

* And whoever is is given knowledge is given indeed abundant wealth. (2:269)

بەپێی قورئان :

ئەوانەی کە ئیمانیان هەیە و ئەوانی کە زانست و زانیاریان هەیە چەندەها پلە بەرزتان دەکاتەوە "سورەتی المجادلە ئایەتی ١١"

بڵێ، پەروەردگارا، زانست و زانیاریم زیادکە ."سورەتی طه ئایەتی١١٤"

هەرکەسێک زانست و زانیاری پێبەخشرابێت لە ڕاستیدا خێرێکی زۆری پێدراوە "البقره٢٦٩"

According to a saying of Prophet Muhammad (pbuh) "It is obligatory for evey Muslim, male or female, to acquire knowledge (Al Bayhaqi).Imagine, 1400 years ago, when the women were ill treated and were only used as property, Islam asked the women to be educated.

بەپێی وتەیەکی پێغەمبەر"درودی خوای لەسەربێت" هەموو موسوڵمانێک پێویستە نێر یاخود مێ زانیاری فەراهەم بێنێت(البیهقی)"، بی هێنە بەرچاو، ١٤٠٠ ساڵ لەمەو بەر ، کاتێک ئافرەتان بەدرەفتاریان لەگەڵ دەکرا و تەنها وەک سامانێک بەکار هێنراون، ئیسلام داوای لە ئافرەت کردوە ڕۆشنبیر بێت.!!!

Because Islam tells that every woman should be educated,- Will you call such women's right's in Islam as modernizing or outdated?

چونکە ئیسلام دەڵێت هەموو ئافرەتێک دەبێت ڕوناکبیر بێت، ئایا تۆ بە مافی ئافرەتان لەئیسلامدا دەڵێیت، مافی هاوچەرخ یاخود کۆنەپەرست.؟!!!

# 5. Legal Rights to a Woman

## مافە یاساییەکانی ئافرەت

According to the Islamic law, men and women are equal - The Islamic Law protects the life and property of a man and woman both. If a man murders a woman he too will receive the capital punishment of 'Qisas'.

بەپێی یاسای ئیسلامی، پیاو و ئافرەت یەکسانن- یاسای ئیسلامی ژیان و سامانی پیاو ئافرەت هەردوکیان دەپارێزێت . ئەگەر پیاوێک ئافرەتێک بکوژێت ئەویش سزایەکی گەورە وەردەگرێت لە تۆڵە "قصاص" دا

According to the Islamic law of'Qisas', men and women - irrespective the injury is of the eye, of the nose, of the ear, of the body - both receive equal punishment.

بەپێی یاسای ئیسلامی تۆڵە "*قصاص*" لە پیاوان و ئافرەتاندا پەیوەندی نیە بە ئازاری چاو، کەپوو، گووێ، جەستە، هەردوکیان سزای یەکسان وەردەگرن .

And if the guardian of the murderer, even it be a woman - If she says, that forgive the murderer and she accepts 'Diyah', that is compensation - her opinion cannot be rejected - they have to accept it.

ئەگەر پارێزەری بکوژ ، تەنانەت ئەگەر ئافرەتیش بێت– ئەگەر بڵێت، لە بکوژەکە خۆشبە ئەوا خوێن بای "دیة" وەردەگرێت ئەمەش خەڵاتە – بیرۆکەکەی ڕەتناکرێتەوە و –ئەبێ قبوڵی بکەن.

And if there's difference of opinion between the relatives of the person who murdered - And some say that the murderer should be killed and some say that he should be forgiven and 'Diyah' should be accepted - people should prevent the relatives from killing that murderer.

ئەگەر بیرو ڕای جیاواز هەبوو لە نێوان خزمەکانی کەسی بکوژ– هەندێکیان بڵێن دەبێت بکوژ بکوژرێتەوە هەندیکیان بڵێن بکوژ دەبێت عافوبکرێت و"دیة " دەبێت قبوڵ بکرێت– دەبێت خەڵک نەهێڵن خزمەکانی بکوژەکە بکوژن.

And irrespective whether the witness or the opinion is given by a man or woman, it has same weight. According to Surah Maida, Ch.5, Verse No.30 - It says… 'As to the thief, whether he be man or a woman, cut off his or her hand as a punishment for his crime, an example from God'.

پەیوەندی نیە کە شاهیدەکە یان بیرۆکەکە هی پیاو بوە یان ئافرەت ، هەمان سەنگی هەیە. بەپێی سورەتی المائدە بەشی ٥، ئایەتی ژمارە ٣٠- دەڵێت... بۆ دز ، ئەگەر پیاو بێت یاخود ئافرەت، دەستی ببڕە وەکو سزایەک بۆ تاوانەکەی، نمونەیەک لە خواوە..

Means, if a person robs, irrespective whether he is a man or a woman his or her hands should be chopped - The punishment is the same. According to Surah Nur, Ch.24, Verse No.2, it says 'If any commits fornication, be it a man or a woman, flog them with 100 stripes'.

واتە، ئەگەر کەسێک دز بێت، پەیوەندی نیە کە پیاو بێت یان ئافرەت دەبێت دەستی ببڕدرێت– سزاکە وەکو یەکە. بەپێی سورەتی النور بەشی ٢٤، ئایەتی ژمارە ٢، دەفەرموێت، ئەگەر هەرکەسێک زینای کرد، ئافرەت یان پیاو، ١٠٠ قامچیان لێبدەن.

The punishment for fornication in Islam irrespective whether it is a man or a woman, it is the same - Flogging with 100 stripes.The punishment for men and women, is the same in Islam. In Islam a woman is allowed to give witness.

سزای زینا لەئیسلامدا پەیوەندی نیە بە پیاو یاخود ئافرەت، سزاکە وەکو یەکە– لێدانی ١٠٠ قامچی. لەئیسلامدا سزا بۆ پیاوان و ئافرەتان وەکو یەکە، لە ئیسلامدا ئافرەت ڕێگە پێدراوە بۆشایەتی دان.

Imagie, Islam gave right to a woman to be a witness, 14 centuries ago. Even now in as late as 1980, the Jewish Rabai, they were considering that whether the women should be given a right to act as a witness or not - And Islam gave that right 1400 years ago.

بی هێنەبەرچاوت، ئیسلام ئەومافەی بە ئافرەت داوە بۆئەوەی شایەتی بدات ،١٤سەدە لەمەوبەر. تەنانەت ئێستالە : ١٩٨٠ (جیوش ڕابی ) ئەوان بیریانکردۆتەوە ئایائافرەت مافی شایەتی پێبدرێت یاخود نا –ئیسلام ئەم مافەی بە ئافرەت داوە ١٤٠٠ ساڵ لەمەو بەر

According to Surah Nur, Ch.24, Verse No.4, it is said 'If any of you put a charge against the chastity of a woman, produce 4 witnesses, and if they falter, flog them with 80 stripes'.

لە سورەتی النور بەشی ٢٤، ئایەتی ژمارە٤ دەفەرموێ، ئەگەر هەریەكێك لەئێوە ئافرەتێكی بێگەردی تاوان باركرد،چوار شایەت بهێنن، ئەگەر نەیان توانی"زمانیان گیرا" ئەوا ٨٠ قامچیان لێبدەن.

In Islam for a small crime, you require 2 witnesses - for a big crime you require 4 witnesses. Accusing a woman falsely is a big crime in Islam, therefore you require 4 witnesses.

لە ئیسلامدا بۆ تاوانی بچوك، پێویستت بە دوو شایەت دەبێت- بۆ تاوانی گەورە، پێویستت بە چوار شایەت دەبێت. بەدرۆ گومان خستنە پاڵ ئافرەتێك گوناهێكی گەورەیە لەئیسلامدا. بۆیە پێویستت بە چوار شایەت دەبێت. !!!

Nowadays you see in the modern society, you find men abusing women and calling them all sorts of name. They call them prostitutes etc, and nothing is done.

ئەورۆ لە گۆمەڵگەی هاوچەرخدا دەبینیت ، پیاوان ئازاری ئافرەتان دەدەن و بە جۆرەها ناوناشیرین بانگیان دەکەن ،پێیان دەڵێن داوێن پیس هتد.... ،هیچ نەکراوە .

In an Islamic state, if a man calls her a 'prostitute' in public or anywhere else, and if she takes that man to court - And if that man cannot produce 4 witnesses or even if he produces 4 witnesses and any one of them falter, all of them will receive 80 lashes each, and in future all their evidence will be rejected.

لە وڵاتێکی ئیسلامیدا، ئەگەر پیاو بانگی ئافرەت بکات بە *"داوێن پیس"* لە شوێنی گشتی، یان هەرشوێنێکی تر، ئەگەر ئەو ئافرەتە پیاوەکە بباتە دادگا– پیاوەکە نەیتوانی چوار شایەت بهێنێت یان ئەگەر چوار شایەتی هێنان، هەریەکێکیان زمانی گیرا، هەرهەمویان یەکەی ٨٠ قامچی وەردەگرن، لەداهاتودا سەرجەم بەڵگەکانیان ڕەتدەکرێنەوە .

Islam gives utmost importance to the chastity of the woman. When a lady marries, she normally adopts the name of her husband. In Islam she has the option of either keeping her husband's name, either adopting the name of the husband, or maintaining her maiden name.

ئیسلام ئەوپەڕی گرنگی بە بێگەردی ئافرەت دەدات. کاتێک خانمێک شودەکات، بەشێوەیەکی ئاسایی ناوی مێردەکەی بەکاردەهێنێ. (مەبەست لەلەقەبوشۆرەتی خێزانیە) لە ئیسلامدا، ئافرەت بژاردەی هەیە یا ناوی مێردەکەی بەکاردەهێنی یاخود ناوی خۆی دەمێنێتەوە .

And maintaining the maiden name is recommended in Islam - And we find in several Muslim societies that women, even after they get married they maintain their maiden name, because according to the Islamic law men and women are equal. Will you call such rights in Islam modernizing or outdated?

مانەوەی ناوی کچێتی لەئیسلامدا پەسندکراوە- ئەو ئافرەتانە لە چەندان کۆمەڵگای موسوڵمانان دەدۆزینەوە، تەنانەت دوای ئەوەی کەشو دەکەن ئەوان ناوی کچێنی خۆیان دەپارێزن، چونکە بەپێی یاسای ئیسلامی ئافرەت و پیاو یەکسانن. ئایا ئەم جۆرە مافانە لە ئیسلامدا بە مافی هاوچەرخ یاخود کۆنەپەرست ناودەبەی

# 6. Political Rights of a Woman

# مافە سیاسیەکانی ئافرەت

According to Surah Tawba, Ch.9, Verse No.71, 'The men and the women they are friends (supporters) of each other'. Supporters not only socially- even politically– Politically, men and women should support each other. Women can even take part in law making.

بەپێی سورەتی التوبە بەشی٩، ئایەتی ژمارە٧١، پیاوان و ئافرەتان هاوڕێی یەکترن "پشتگیری یەکتر"ن، نەک تەنها لەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە هاوکاری یەکترن- تەنانەت لە سیاسەتیشدا- لە سیاسەتدا پیاوان و ئافرەتان دەبێت هاوکاری یەکتر بن. تەنانەت ئافرەتان دەتوانن بەشداربن لە بنیات نانی یاسا.

And according to the famous Hadith in which Hazrat Umar (may Allah be pleased with him), he was discussing with the Sahabas, and considering putting an upper limit on the 'Meher ', since young men were discouraged from getting married - a lady from the back seat she objected and said When the Qur'an says in Surah Nisa Ch.4, Verse No.20 that... 'you can even give a heap of treasure, a heap of gold in 'Meher', when Qur'an puts no on 'Meher', who is Umar to put a limit (may Allah be pleased with him).

بەپێی فەرمودەیەکی بەناوبانگ کە حەزرەتی عومەر "ڕەزای خوای لەسەربێت" لەگەڵ سەحابەکاندا تاوتوێی دەکرد،کە سنورێک بۆ حەقەمارەی دابنرێت، لەوکاتەی کە گەنجەکان نەیان دەتوانی ژن بهێنن-خانمێک کەلەدواوە دانیشتبوو بەرهەڵستی کردوو گوتی. کاتێک قورئان لە سورەتی النساء دا بەشی ٤،ئایەتی ژمارە٢٠، تەنانەت دەتوانیت سەروەت سامانێکی زۆری پێبدەی "لە مارەیدا" لە کاتێکدا قورئان سنور بۆ مارەی دانانێت، عومەر کێیە بۆئەوەی سنوری بۆدابنێت"خوا ڕەحمی پێبکات"

And immediately Hazrat Umar (peace be upon him) said… 'Umar is wrong and the lady is right'. Imagine, she was a common lady - If it would have been a famous lady, the name of the lady would be mentioned in the Hadith.

یەکسەر حەزرەتی عومەر " ڕەزای خوای لەسەربێت " گوتی … عومەر هەڵەیە و خانمەکە ڕاستە. بێنە بەرچاوت، ئەو ئافرەتە کەسێکی ئاسایی بوو- خۆ ئەگەر کەسێی ناسراویش بوایە، ناوی ئافرەتەکە ئەبوایە ئاماژەی پێکرابا لە فەرمودەکەدا.

Since the Hadith does not mention the name of the lady, we can understand that the lady was a common lady. Means, even a common lady can object to the 'Khalifa', the head of the state.

لە کاتێکدا فەرمودەکە ئاماژە بەناوی خانمەکە ناکات، لەوەوە تێدەگەین کە ئافرەتەکە کەسێکی ئاسایی بووە .واتە، تەنانەت خانمی ئاسایش دەتوانێت بەرهەڵستی "خەلیفە"بکات کە"سەرۆکی دەوڵەتە"

And in technical terms it would be called that – 'she is objecting to the breach of the constitution',- because Qur'an is the constitution of the Muslims - That means a woman can even take part in law making.

لە زارەوە تەکنیکیەکاندا دەتوانرێت بووترێت- ئەو"خانم"ە بەرگری لە شکاندنی دەستور دەکات"چونکە قورئان دەستوری موسوڵمانانە – واتە ئافرەت دەتوانێت بەشدار بێت لەبنیات نانی یاسا.



## A- Women have even taken part in the battle fields

## ئافرەتان لەمەیدانی جەنگیشدا بەشداریان کردوە.

There is a full chapter in the Sahih Bukhari mentioning women in the battle field - Women gave water - they give first aid to the soldiers. Because the Qur'an says 'Man is the protector of the 'Woman'.

بەشێکی تەواو لە صحيح البخاري دا هەیە کە ئاماژە بە ئافرەتان دەکات لەمەیدانی جەنگدا.- ئافرەتان ئاویان بەخشیوە- فریاگوزاری سەرەتایی دەدەن بە سەربازەکان. چونکە قورئان دەفەرموێت پیاو پارێزەری "ئافرەتە"

Under normal circumstances, the women should not go to the battle field. It is the duty of the man.

لە بارودۆخی ئاسایدا، پێویست ناکات ئافرەتان بچن بۆ مەیدانی جەنگ، ئەمە ئەرکی پیاوانە.

Only when required, under necessity are women allowed - and they should go to the battle field if they want. Otherwise you'll have the same position as you are having in the USA.

تەنیا لە حاڵەتی پێویستی، لە پێویستیدا ئافرەتان ڕێگە پێدراوون– ئەگەر بیان هەوێت دەتوانن بچن بۆ مەیدانی شەڕ ئەگەرنا، هەمان کارت دەبێت هەروەک هەتە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

During the battle of Uhud, a lady by the name Nasiba was among the people who protected the Prophet (Pbuh) and while doing so she received several wounds and injuries for which the Prophet (Pbuh) appreciated and praised her.

لە جەنگی ئوحودا، خانمێک بەناوی نوسیبە لە نێو ئەوانەدا بوو کە پێغەمبەری خودا یان دەپاراست، کە ئازارو چەندان برینی بەرکەوتبو، پێغەمبەریش درودوسەلامی خوای لێبێت ئەمەی بەرز نرخاند و سوپاسی کرد.

# B-Women in USA are Not Safe

ئافرەتان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاسەلامەت نین.

In USA women were allowed to join the battle since 1901 but they were not allowed to take active part - They only played the part of a nurse. Later on after the 'Feminist Movement' had started in 1973, the 'Feminist movement' demand-ed – 'Why aren't women allowed to take active part in the battle field?'

لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئافرەتان ڕێگە پێدراون بۆنەوەی بەشداربن لە شەڕدا لە ١٩٠١ بەڵام ڕێگە پێدراو نەبوون بۆ ئەوەی ڕۆڵی کارایان هەبێت تەنیا ئەرکی پەرستاریان دەبینی . دواتر ، لەدوای "ڕێبازی یەکسانی ژن و پیاو لە مافدا" کە لە ١٩٧٣ دەستی پێکردبوو ، "ڕێبازی یەکسانی ژن و پیاو لە مافدا" داوایکرد – بۆچی ئافرەتان ڕێگە پێدراو نین بۆ ئەوەی ڕۆڵ ببینن لەمەیدانی جەنگدا؟

So the American government allowed women to take active part in the battle field.And according to a report of the Defense Department of America, which was released on the 23rd of April, 1993 it said that, '90 people were sexually assaulted in a convention, out of which 83 were women and 117 officers were charged with in disciplinary action'. Imagine in one convention only, 83 women sexually assaulted.

بۆیە حوکمەتی ئەمریکا ڕێگەی دا بەئافرەتان بۆ ئەوەی چالاکیان هەبێت لە مەیدانی شەڕدا. بەپێی ڕاپۆرتی "*بەشی داکۆکی لە ئەمریکا*" کەلە ٢٣ نیسانی ١٩٩٣ بلاوکریەوە وتویەتی، لەیەک کۆنگرەدا ٩٠کەس دەست درێژی سیکسیان کراوەتە سەر لە یەک کۆبونەوەدا. کە ٨٣ ئافرەت بوون و ١١٧ ئەفسەر بەو کارە تۆمەت بارکراون.

تێڕامێنە!! تەنیا لەیەک کۆنگرەدا ٨٣ ئافرەت دەستدرێژی سێکسیان کراوەتە سەر. !!!

What was the crime of those 117 officers? They made the women run and they snatched at their clothes. They made them parade absolutely nude without even covering the genital parts. They were made to have sex in public. Is this what you call 'Women's rights'?

تاوانی ئەو ١١٧ ئەفسەرە چی بوو ؟ وایان لەئافرەتەکان کرد ڕاکەن پاشان لەدواوە جلەکانیان داماڵین. پەلاماریان دان بەڕوتی، تەنانەت بەبێ ئەوەی هیچ جلێکایان لەبەر بێت، بە ئاشکرا ناچاریان کردن کە سێکسیان لەگەڵ بکەن . ئایا ئەوەیە کە تۆ پێی دەڵێیت مافی ئافرەتان؟

If you think that this is what 'Women's right' is, then you can keep your rights to yourselves. We do not want our sisters, our daughters our mothers to be sexually assaulted.

ئەگەر پێت وایە ئا ئەوەیە مافی ئافرەتان، پاشان دەتوانیت مافەکانی خۆت بۆخۆت بپارێزی. ئێمە نامانەوێت خوشکەکانمان، کچەکانمان دایکەکانما دەست درێژی سێکسیان بکرێتە سەر.

And there was a uproar in the parliament and the President, Bill Clinton - he himself had to apologize publicly and he said, 'Necessary action will be taken'.And you know when politicians say 'necessary action will be taken, what happens. So Islam allows women to take part in the battle field only when required. But there also they should maintain their Islamic dress and the Islamic ethics, and their modesty.

لە پەرلامانیشدا هاتوهاوار هەبوو سەرۆکیش ، **بیل کلینتن**- خۆی ناچاربوو کە داوای لێبوردن بکات بەئاشکرا و گوتی: کاری پێویست دەکرێت. دەزانی کاتێک سیاسیەکان دەڵێن" **کاری پێویست دەکرێت**" چی ڕوودەدات . بۆیە، ئیسلام ڕێگە دەدات بە ئافرەتان کە بەشداربن لە مەیدانی جەنگدا تەنیا لەکاتی پێویستیدا. بەڵام دەبێت بەجلک و پۆشاکی ئسلامی بێت بە ڕەوشتی ئیسلامی هاروەها بە داوێن پاکیان.

## *C- USA Has One of the Highest Rates of Rape*

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پلەی یەکەمە لە دەست درێژی

United States of America is supposed to be one of the most advanced countries of the world. It also has one of the highest rates of rape in any country in the world. According to a FBI report, in the year 1990, every day on an average 1756 cases of rape were committed in U.S.A alone

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دانراوە بە یەکێک لە وڵاتە پێش کەوتووەکانی جیهان. هەروەها پلەی یەکەمی لە دەستدرێژی هەیە لە هەروڵاتێکی جیهاندا، بەپێی *"ئێف بی ئای"* لە ساڵی ۱۹۹۰، هەموو ڕۆژێک لەیەک ئاماردا ۱۷۵٦ حاڵەتی دەستدرێژی کراوە تەنیا لە *"یو ئێس ئەی"*

Later another report said that on an average everyday 1900 cases of rapes are committed in USA. The year was not mentioned. May be it was 1992 or 1993. May be the Americans got 'bolder' in the following years.

دواتر راپۆرتێکی دیکە گوتی لەیەک ناوەندا هەموو رۆژێک ١٩٠٠ حاڵەتی دەستدرێژی کراوە لە "یو ئێس ئەی" ئاماژە بەساڵەکە نەکراوە. لە وانەیە لە ساڵی ١٩٩٢ یان ١٩٩٣ بوبێت. لەوانەیە لەساڵانی دواتر ئەمریکیەکا ن خراپتربوبن .!!



## *D-Islamic Law Let's Women Breathe Easily*

## یاسای ئیسلامی "ڕێگە دەدات ئافرەتان بەئاسانی هەناسە بدەن"!!

Consider a scenario where the Islamic law is implemented in America. Whenever a man looks at a woman and any brazen or unashamed thought comes to his mind, he lowers his gaze. Every woman wears the Islamic dress as mentioned in Quran.

بەپێی سیناریۆیەک کە یاسای ئیسلامی تێیدا خرایەگەڕ لە ئەمریکا، هەرکاتێک پیاو سەیری ئافرەتی کردبا بیرو خەیاڵی بێشەرمانەی دەکەوتە مێشکەوە، چاوەکانی نزم دەکردەوە. هەموو ئافرەتێک جلک و پۆشاکی ئیسلامی دەپۆشی هەروەک لە قورئاندا باسکراوە.

After this if any man commits rape he is given capital punishment. I ask you, in such a scenario, will the rate of rape in America increase, will it remain the same, or will it decrease? If Islamic law is implemented in any part of the world, women will breathe easier.

دوای ئەوە ئەگەر هەر پیاوێک دەست درێژی بکات سزایەکی گەورە وەردەگرێت. من پرسیار لەتۆ دەکەم، لەسیناریۆیەکی وادا، ئایا پلەی دەست درێژی بەرزدەکاتەوە، وەک خۆی دەمێنێتەوە یاخود نزمی دەکاتەوە؟ ئەگەر یاسای ئیسلام لەهەر بەشێکی جیهان جێبەجێ بکرێت، ئەوا ئافرەتان ئاسانتر هەناسە دەدەن.

# Conclusion

# لەكۆتایدا

Before I conclude, I'd like to give an example. As I said in the beginning of my talk, Islam believes in equality between men and women - Equality does not mean identicality.

بەرلەكۆتایی، حەزدەكەم نمونەیەک بخەمەڕوو. هەروەک لەسەرەتای قسەكانم وتم ئیسلام باوەڕی بەیەكسانی پیاو ئافرەت هەیە-یەكسانیش بەواتای وەكویەک نایەت.

Suppose in a classroom 2 students, student 'A' and 'B', during an examination both come out first - Both secure 80% marks - 80 out of 100. When you analyze the question paper, the question paper has 10 differ-ent questions, each carrying 10 marks.

وای دابنێ لەژوورێكدا دوو قوتابی "ئەی" و "بی" لەماوەی تاقیكردنەوەدا، سەرەتا هەردوكیان بەیەكەوە دێنەدەرەوە،- هەردوكیان ٨٠ نمرە دەهێنن- ٨٠ لەسەر ١٠٠. كاتێک كاغەزەی تاقیكردنەوە لێكدەدەیتەوە، وەرەقەی تاق كردنەوە ١٠ پرسیاری جیاوازلەخۆی دەگرێت، هەریەكەشیان ١٠ نمرەی لەسەرە.

In question 1 student 'A' got 9 out of 10, and student 'B' got 7 out of 10 - So in question 1 student 'A' was higher than student 'B'. In question 2, student 'A' got 7 out of 10 and student 'B' got 9 out of 10 - Student 'B' was higher than student 'A' in question number 2.

لەپرسیاری یەکەم قوتابی"ئەی" ٩لە١٠ دێنێت، قوتابی "بی"ش ٧ لە ١٠ دێنێت- کەواتە لە پرسیاری یەکەمدا قوتابی "ئەی"بەرزتر بوو لە قوتابی"بی" .لە پرسیاری دووەم "ئەی" ٧ لە ١٠ دێنێت و"بی"ش ٩ لە ١٠ دێنێت – قوتابی "بی"بەرزتر بوو لە قوتابی"ئەی" لە پرسیاری دووەمدا.

In question 3 both of them got 8 out of 10, both were equal .So when we add up the marks of all the ten questions, both student 'A' and 'B' got 80 out of 100.

لەپرسیاری سێهەمدا هەردووکیان ٨ لە ١٠ دەهێنن ، هەر دووکیان یەکسان بوون . بۆیە کاتێک ئێمە نمرەی هەر دەپرسیارەکە کۆدەکەینەوە ، هەردوو قوتابی"ئەی"و"بی"٨٠ لە ١٠٠ یان هێناوە.

So in short, student 'A' and student 'B' are over all equal. In some questions 'A' is higher than 'B', in some questions 'B' is higher than 'A', in others both are equal.

بۆیە بەکورتی، قوتابی"ئەی"و قوتابی"بی" سەرەڕای هەمووی یەکسانن. لەهەندێک پرسیاردا"ئەی" بەرزترە لە "بی". لەهەندێک پرسیاردا "بی" لە ئەی بەرزترە، لەهەندێکی تردا هەردووکیان یەکسانن.

In the same fashion, taking the example that since God has given man more strength - Suppose a thief enters the house will you tell, 'I believe in women's rights - I believe in women's rights' - will you tell your mother, your sister and your daughter, to go and fight the thief?'

بەهەمان شێوە، ئەو نمونەیە وەرگرین کەلەو کاتەی خوا هێزی زیاتری بەمرۆڤ بەخشیوە- وای دابنێ، دزێک ئەچێتە ماڵێکەوە ئایا دەڵێیت، من بڕوام بەمافی ئافرەت هەیە- من بڕوام بەمافی ئافرەت هەیە، ئایا بەدایکت دەڵێیت، بە خوشکەکەت و کچەکەت، بۆ ئەوەی بچێت و شەڕ لەگەڵ دزەکە بکات؟

No, but natural you'll fight him - If required they may interfere - Under normal circumstances since God has given you more physical strength, you have to go and tackle the thief.

نەخێر، بەڵکو سروشتیەن تۆ شەڕەکە دەکەیت- ئەگەر پێویست بێت لەوانەیە ئەوانیش بەشداربن- لەژێر بارو دۆخی ئەخلاقیدا- لەبەرئەوەی خوا هێزی جەستەی زیاتری پێبەخشیووی، تۆ پێویستە بچی و دزەکە ڕاوبنێی.

So here, in physical strength, man is one degree higher than the woman, Let us take another example where it comes to respecting the parents - The children are supposed to respect the mother 3 times more than the father (as mentioned earlier).

بۆیە لێرەدا، لەبەهێزی جەستەدا، پیاو بە پلەیەک بەرزترە لە ژن، با نمونەیەکی تر بخەینەڕوو کەڕێز گرتنە لەدایک و باوک- منداڵان پێویستە ڕێز لەدایکیان بگرن بە سێ جار زیاتر لە باوکیان"وەک پێشتر ئاماژەی پێکراوە"

Here the women have one degree higher than the men - Overall both equal. So Islam believes in equality, not identically - Men and women are over all equal in Islam. This was in brief, the highlights, of 'the Women's Rights in Islam'.

له پیاوان- سەرەڕای هەموو لێرەدا ئافرەتان نمرەیەكیان بەرزترە شتێك هەردوكیان یەكسانن. بۆیە ئیسلام باوەڕی بە یەكسانی هەیە تی -پیاوان و ئافرەتان لە ئیسلامدا یەكسانن . ئەمە ، نەك چۆنیە بەكورتی بوو ، سەردێڕەكانی مافەكانی ئافرەت لە ئیسلامدا.

After this what the Muslim society did is different - Many of the Muslim societies did not give the women their rights and they deviated away from the Qur'an and the Sunnah.

لەدوای ئەوە هەرچیەك كە كۆمەڵگەی موسوڵمان كردویەتی جیاوازە- زۆر لە كۆمەڵگە موسوڵمانەكان مافی ئافرەتانیان نەداوە و لە قورئان و سوننەت دورکەو تونەوە.

The Western society is largely responsible for this - because of the Western societies, many Muslim societies have become over protective, over precautions and have gone to one extreme and deviated away from the Qur'an and the Sunnah.

کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا بەڕادەیەکی زۆر لەوە بەرپرسیارە- لەبەر کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان، زۆر بەی کۆمەڵگە موسوڵمانەکان خۆپارێزی،وریایان نەماوە بەرەو ئاڕاستەیەک ڕۆیشتوون کە لەقورئان و سوننەت دورکەوتونەوە.

On the other extreme, some of the Muslim societies turned to the Western culture, and followed their culture. I want to tell the Western society that if you analyze the women's rights in Islam according to the Qur'an and the Sunnah - you will realize it is modernizing and not outdated.

لەلایەکی تر، هەندێک لە کۆمەڵگە موسوڵمانەکان کەلتوری شوێنی کەلتورەکەیان کەوتون. ئەمەوێت بە ڕۆژئاوایان وەرگرتووە، بە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا بڵێم کە ئەگەر تۆ مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا لێکدەدەیتەوە بەپێی قورئان و سوننەت– دەزانیت کە مافەکان مافی کۆنەپەرستن یاخود هاوچەرخن......؟؟؟!!!!!

# وتەی کۆتایی

دەڵێن و گوتراوە لەسەر کتێبی وەرگێردراو،ئەگەر چاکت وەرگێڕاو باش دەرچوو خوێنەران بەدڵیان بوو، ئەوە دەست خۆشی لەنوسەرەکە دەکەن و دەڵێن بەڕاستی چاکی نوسیوەو نوسەر ئاوادەبێت. خۆ ئەگەر خوای نەخواستە باش دەرنەچوو بەدڵی خوێنەر نەبوو کتیبەکە دەڵێن کاکە جا ئەوە وەرگێرە کتێبەکەشی سەقەت کردوە، واتا بەهیچ بارێک دا دەست خۆشی لەوەرگێڕ ناکری .

وەرگێڕێک بەنمونە(مامۆستاهەژارموکریانی) هەرکتێبێکی وەرگێڕابێت گەیاندویەتە کەش کەشانی فەلەک. بەشاهێدی زمان زان و ئەدیبان زۆرجار گووتویانە نوسەرەکە ئاوای نەزانیوە بینوسێ. شەرەفنامە بەنمونە. (مام هێمن ) لەبارەیەوە دەڵێت: دەڵێ بەکوردی رسکاوەو نوسراوە، بەڵام هەردەڵێن / بەڕاستی جاکی نوسیوە (شەرەفخان).... خولاسە تۆی بەڕێزی خوێنەریش جی دەڵێ ی و چۆنم باس دەکەی گەردنت ئازاد بێت. چونکە ئەوشتەی هەیە یان ئەوکەسەی بونی هەبێت باس دەکرێت .... لەهەڵەو کەمو کوڕیەکانیشامان ببورن، چونکە بەس کتێبی خوا بێ هەڵەو کەموکوڕیە....

# سەرچاوەکان

- Islamawareness.net/Women/ Zakir Naik_Women.Homepage
- Naik,z.,Women Rights in Islam - Modernising or Outdated?,idex.

## لە بەرهەمەکانی وەرگێڕ

١- ئایا قورئان وتەی خوایە......... د. زاکیر نایك

٢-باغە نهێنیەکە/ ئینگلیزی + کوردی/. فرانسس هۆگسن بێرنت

٣- مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا.../ ئینگلیزی + کوردی د. زاکیر نایك

## ئەو بەرهەمانەشی چاوەڕێی چاپن

١- بوکەکانی جەنگ........ مێریەن کرەیگ وێنتوێس... بە سەرپەرشتی: تروسکە محمد علاالدین.

٢- ولیەم شەیکسپیر و ٨ لە دیارترین شانۆکانی بە شێوەی کورتە چیرۆك......... هەڵەچن و پێداچونەوەی: کەی زین خەلیل.

٣- ئەوینی پاشایەك......... پیتەر دەینتی

٤- پارە یاخود ئەوین......... ڕۆوینا ئاکنیامی

٥- توتیەکەی جاك......... پۆڵ هێرن و یەتز ئۆزکان

٦- چنگی مەیمونەکە.........ولیەم وایمارك جاکۆبس

٧- سروودی کرسمس .........چارلز دیکنز

## سوپاسنامە:

سوپاس و دەست خۆشی خۆم ئاڕاستەی زۆر بەڕێز "مامۆستا تروسکە محمد علاءالدین" دەکەم "مامۆستای زانکۆ لە زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی ئاداب ئینگلیزی" کە یارمەتیەکی بێ وێنەی داوم لە وەرگێڕانی ئەم پەرتوکە خنجیلانەیە.

# Content ناوەرۆك

# WOMEN RIGHTS IN ISLAM
## MODERNISING OR OUTDATED?

DR.ZAKIR NAIK
TRANSLATED BY
ABUBAKIR AHMED
SUPERVISED BY:
TRUSKA MUHAMAD

له ماناقوڵ وکامڵەکانی قورئاندا بەدوای نرخ و بەهای ئافرەتتدا بگەڕێیین ، نەلە فلان و فیسار نە لە بیردۆزەی بەشەری کەهەمویان بۆتێرکردنی حەزوو ئارەزووی جنسی یاساو ڕێسایەکی کاتی و شەهوانین داتاشراوون ، بۆیە لێرەدا ( نایک ) بەوردی باس لە نرخ و بەهای ئافرەت دەکات لە ئیسلامدا کە هەردوو رەگەز یەکسانن لە ئیسلامدا و هیچ جیاوازیەکیان لە نێواندا نیە.

پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژوەوان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك و ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێ بوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە .(هەر کە دنیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن).

جودی



نرخی سێ هەزار دینارە




ناونیشان: سلێمانی سەرشاری شەقامی
مەولەوی - قەرەی سەعید تەها ...
07701575060 - 07501128388